# هەڵە باوەکانی

## دایکان و باوکان بەرامبەر بە منداڵەکانیان



محەمەدساڵح پیتدرۆیی (جگەرسۆز)

هۆکارەکانی

زیانەکانی

چارەسەرەکانی

بەرگی یەکەم

٢٠١٦



ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: هەڵە باوەکانی دایکان و باوکان بەرامبەر بە منداڵەکانیان

نووسینی: محەمەدساڵح پێندرۆیی (جگەرسۆز)

هەڵگەری: نووسەر

دەرهێنانی هونەری: یعقوب قادر پیرۆت

بەرگ: شێرکۆ ئەحمەد

بەرگی: یەکەم

چاپی: یەکەم

نرخ: ٣٥٠٠ دینار

تیراژ: ١٠٠٠دانە

ساڵی: ٢٠١٦

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان ژمارەی سپاردن( ٦١٨ )ی ساڵی (٢٠١٦)ی پێدراوە

# ناوەڕۆک

## دەستپێک

## بەناوی خودای مەزن و دلۆڤان

خێـزان بـە بـەردی بناغـەی کۆمـەڵگـە هـەژمار دەکرێـت، بناغـەی خێزانیش لەسەر دەستی ژن و پیاو یان دایـك و باوك دێتـە دانـان، بۆیـە ئەگەر ئەو بناغەیە پەیت و پتەو بوو، بێگومـان دیوارەکەیشی پەیت و پتەو دەبێت، بـەڵام ئەگـەر بناغەکەی سست و لـەرزۆك بـوو! بێگومـان دیوارەکەیشی سست و لەرزۆك دەبێت و لە هەر چرکەساتێکدا، ئەگەری ئەوە هەیە بڕووخێت و لەناوبچێت!

بۆیە دایکان و باوکان ڕۆڵێکی زۆر کاریگـەر و گـەورەیان هەیـە لـە پێگەیاندن و تێگەیاندن و پەروەردە و فێرکردنـی منداڵـەکان و نـەوەکانی ئێسـتا و ئاینـدە. تەنانـەت یەکـەمین قوتابخانـەی منـداڵ بریتییـە لـە خێزان، بۆیـە ئەگـەر منـداڵ لـە قۆنـاغی یەکـەم و قوتابخانـەی یەکـەم لێهـاتوو و سـەرکەوتوو بـوو، بێگومـان هۆکـارێکی کاریگـەر دەبێـت بـۆ ئـەوەی لـە قۆناغـەکانی دیکەشـدا لێهـاتوو و سـەرکەوتوو بێـت، بـەڵام ئەگـەر لـە قۆنـاغی یەکـەم و قوتابخانـەی یەکـەم لێهـاتوو و سـەرکەوتوو نەبوو، ئەوا ئەستەمە لە قۆناغ و قوتابخانەکانی دیکەی ژیاندا لێهاتوو و سـەرکەوتوو بێت و بتوانێت لە گشت کایەکانی ژیاندا ببێتـە کەسـێکی لێهاتوو و پێشکەوتوو و سەرکەوتوو.

لەم سۆنگەیەوە بە پێویستم زانی تیشکێك بخەمـە سـەر ئـەو هەڵـە و چەوتییانـە، کـە دایکـان و باوکـان لـە ژیـانی ڕۆژانەیانـدا دەرهـەق بـە منداڵـەکانیان ئـەنجامی دەدەن، چونکـە ئەگـەر ئـەم هەڵـە و چەوتییانـە

دەستنیشان نەکرێن و ڕاست نەکرێنەوە، دواجار هەڵەکان لەسەر یەکتری کەڵەکە دەبن و نەوەکانمان بەلاڕێدا دەبەن و بەرەو ئاقارێکی ناڕاست و ناپەروەردەیی ناراستە دەکەن و دەرئەنجامێکی خراپیشی لێدەکەوێتەوە و ئایندەی نەوەکانمان و کۆمەڵگەش دەکەوێتە بڤە و مەترسییەوە.

بۆیە پێموایە دەست خستنە سەر کێشە و ئارێشەکان و دەستنیشانکردنی دەرد و زامەکان و دۆزینەوەی ژان و برینەکانی خێزان، هۆکارێکی کاریگەرە بۆ نەهێشتنی گرێکوێرە خێزانی و کۆمەڵایەتییەکان و دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی زیندوو و تەندروست و بەختەوەر.

ئەڵبەتە هەڵەکان زۆرن، بۆیە بەباشم زانی لە دوو بەرگدا ئاماژە بەو هەڵە باوانە بکەم کە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، هەروەها بە پێویستیشم زانی کە چارەسەر بۆ هەر هەڵەیەك بخەینە ڕوو، بۆ ئەوەی لەمەودوا دایکان و باوکان خۆ لەو جۆرە هەڵانە بپارێزن و بە بەرچاوڕوونییەوە سەرەدەری(تعامل) لەگەڵ منداڵەکانیان بکەن و بتوانن نەوەیەکی دانا و زانا و بەتوانا و وشیار و بێدار و تێگەیشتوو و پێگەیشتوو و پێشکەوتوو سەرکەوتوو و پشتبەخۆبەستوو و متمانە بەخۆبوو پێشکەش بە کۆمەڵگە بکەن.

لە کۆتاییدا هیوادارم ئەم پەرتووکە ببێتە هەوێنی خۆشەویستی لە نێوان دایکان و باوکان و منداڵەکانیان، هەروەها کەلێنێکی بچووکیش لە پەرتووکخانەی کوردی پڕ بکاتەوە.

محەمەدسالح پێندرۆیی (جگەرسۆز)

بەحرکە/ ٢٠١٦

## بێ ئامانجی(نەبوونی ئامانج)

گرنگی ئامانج بۆ مرۆڤ، وەك گرنگی گیانە بۆ جەستە، واتە چۆن جەستە بەبێ گیان ناتوانێ زیندوو بێت و جووڵە بکات، ئاوا مرۆڤی بێ ئامانجیش ناتوانێ لە ژیاندا بەزیندوویی بمێنێتەوە و خزمەت بە خۆی و کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بکات.

مخابن،گەورەترین هەڵە،کە هەندێ لە دایکان و باوکان لە ژیانی خۆیاندا ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە نەبوونی ئامانج، بە واتایەکی دیکە، ئەوان هیچ ئامانجێکی گەورە و بچووك و دوور و نزیکیان نییە لە ژیاندا، بەتایبەتی لە بواری پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانیاندا، بۆیە ڕووبەڕووی کێشەگەلێك دەبنەوە و باجێکی قورسیش دەدەن، هۆکاری نەبوونی ئامانجیش لەلایەن ئەو جۆرە دایك و باوکانەوە بۆ چەند خاڵێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- ئەو جۆرە دایك و باوکانە، هیچ جۆرە پلان و بەرنامەیەکیان نییە بۆ ژیان.
- ڕێکنەکەوتنی دایك و باوك لەسەر دیاریکردنی ئامانجەکان
- نەبوونی ئەزموونێکی سەرکەوتوو لەو بوارەدا.
- نەخوێندەواری و نزمی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری دایك و باوك.
- نەبوونی دیدگەیەکی ڕۆشن بۆ ئایندە.
- ژیان بەسەربردن بەشێوەیەکی هەڕەمەکی.
- خۆدزینەوە لە ئەرك و بەرپرسیارەتی.
- بێباکی و خەمساردی.
- چاولێکەری و لاساییکردنەوە.

- بێبەشبوون لە توانا زانستی و پەروەردەیەکان.
- ناوشیاری و دواکەوتوویی.
- هەژاری و دەستکورتی.
- فرەکاری و پڕشوولی.
- بەردەستنەبوونی توانا ماددی و مەعنەوییەکان.
- هەبوونی کێشە و گرفتە دەروونی و جەستەیی و خێزانی و کۆمەڵایەتییەکان.

ئەڵبەتە ئەگەر دایك و باوك هیچ ئامانجگەلێکیان نەبێت لە ژیاندا، هەم خۆیان، هەمیش منداڵەکانیان و کۆمەڵگە بەگشتی زەرەرمەند و ڕەنجەڕوو دەبن، گرنگترین ئەو زیانانەش ئەمانەن:

- منداڵ هیچ ئامانجێکی لە ژیاندا نابێت، کە لە پێناویدا تێبکۆشێت و کاری بۆ بکات!
- منداڵ ناتوانێ وەك پێویست سوود لە توانا هزری و زانستی و جەستەیەکانی خۆی وەربگرێت.
- منداڵ لە ڕاپەڕاندنی ئەرك و کارەکانیدا، ناتوانێ پشت بە خۆی ببەستێت.
- منداڵ فێرە چاولێکەری و لاساییکردنەوە دەبێت و بەلاڕێدا دەچێت و بۆ هێنانەدی ئامانجەکانی کەسانی دیکە تێدەکۆشێت.
- لە بەهرەکانی ژیان بێبەش دەبێت.
- توانا و بەهرەکانی دەپۆکێنەوە.
- لە بۆشاییدا ژیان بەسەر دەبات.
- کەسێکی نەرێنی دەبێت.

- هەست بە بەرپرسیارەتی ناکات.
- دەبێتە کەسێکی بێباك و خەمسارد.
- کارەکانی خۆی بە جوانی و ڕێکوپێکی ئەنجام نادات و جددی نابێت.
- لە ژیاندا سەرکەوتوو نابێت.
- هەم دایك و باوك و خێزان، هەمیش کۆمەڵگە لە توانا و بەهرەکانی ئەو جۆرە منداڵانە بێبەش دەبن.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە:

بۆ ئەوەی دایکان و باوکان لە ژیانی خێزانی خۆیاندا ڕەنج بەخەسار نەبن و بتوانن نەوەیەکی زانا و دانا و تێگەیشتوو و پێگەیشتوو و پێشکەوتوو و سەرکەوتوو پەروەردە بکەن و پێشکەش بە کۆمەڵگە بکەن، دەبێ ئەم هەنگاوە گرنگانە بهاوێژن:

- دەبێ ئامانجی دوورمەودا و نزیکمەودایان هەبێت.
- دەبێ ئامانجەکانیان بەپێی پلان و بەرنامەیەکی تۆکمە بێت.
- دەبێ هەموو ئەگەرەکان دیراسە بکرێن.
- دەبێ دایك و باوك بڕوایان بەو ئامانجانە هەبێت کە هەیانە.
- دەبێ دایك و باوك گەشبین بن و بە گەشبینی بڕواننە ئەو ئامانجگەلانە کە هەیانە.
- دەبێ بە جددی کار و کۆشش بۆ ئامانجەکانیان بکەن.
- دەبێ ئامانجەکان قۆناغبەندی بکرێن و ڕەچاوی ژینگە و تەمەنی منداڵ بکرێت.

- دەبێ دایک و باوک ئاشنا بن بە قۆناغەکانی گەشەکردنی منداڵەکانیان.
- دەبێ حەز و ئارەزوو و خواستەکانی منداڵەکانیان لەناو ئەو ئامانجگەلانەدا ڕەنگبداتەوە.
- پێویستە ئامانجەکان واقعی بن و قابیلی جێبەجێکردن بن.
- دەبێ هۆکارەکانی جێبەجێکردنی ئامانجەکان بەردەست بن.
- دەبێ ئامانجەکان گشتگیر بن و هەموو بوارێکی ژیان بگرنەوە.
- پێویستە ئامانجەکان ڕۆشن و دیار بن.
- دەبێ ئامانجەکان گونجاو و سوودبەخش بن و دوور بن لە بەلاڕێدابردن و یاخیکردن.
- دەبێ ئەو ئامانجانە لەسەر بنەمایەکی زانستی و بابەتی داڕێژرا بن.
- پێویستە لە کاتی پێویست سوود لە کەسانی پسپۆر و شارەزا وەربگیرێت.
- دەبێ بەدواداچوون بۆ ئامانجەکان بکرێت، ئاخۆ ئاستەنگەکان چین و تا چەند ئامانجەکان جێبەجێ کراون.
- دەبێ کات و ماوەی ئامانجەکان دیار بێت.

## بێ پلانی(نەبوونی پلان)

پلان، بەردی بناغەی سەرکەوتنی مرۆڤە لە ژیاندا، بۆیە مرۆڤی بێ پلان و بەرنامە، ناتوانێ لە ئەرك و کارەکانیدا سەرکەوتوو بێت و قۆناغە سەختەکانی ژیان ببڕێت و بەسەر کۆسپ و ئاستەنگەکانیدا زاڵ بێت.

مخابن! یەکێك لە هەڵە باوەکانی دایکان و باوکان بەرامبەر بە منداڵەکانیان، نەبوونی پلان و بەرنامەڕێژییە بۆ ژیان بەگشتی و بۆ پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانیان بە تایبەتی، ئەمەش بۆ چەندین هۆکاری جیاجیا دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- نەبوونی مەبەست و ئامانج لە ژیاندا.
- نەبوونی پێوەر بۆ ژیان.
- نەبوونی هەڵسەنگاندن و چاودێری و بەدواداچوون بۆ کار و ئەرکەکانی خۆیان و منداڵەکانیان.
- پەی نەبردن بە گرنگی پلان و بەرنامەڕێژی بۆ ژیان.
- هەر لە منداڵییەوە ڕانەهاتوون لەسەر ژیانێکی پلان بۆ داڕێژراو.
- ژیان بەسەربردن بەشێوەیەکی هەڕەمەکی و ناڕێکوپێك.
- نەخوێندەواری و نزمی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری دایك و باوك.
- گەورەبوونی دایك و باوك لەناو ژینگەیەکی نالەبار و ناگونجاودا.
- چاولێکەری و لاساییکردنەوەی خەڵکانی دیکەی بێ پلان و بەرنامە.
- ناوشیاری و بێئاگایی دایك و باوك.
- هەبوونی کێشە و بگرە و بەردەی خێزانی و کۆمەڵایەتی.

- هەژاری و دەستکورتی.

ئەڵبەتە ئەگەر دایکان و باوکان پلان و بەرنامەڕێژییان نەبێت بۆ پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانیان، ئەوا نەك هەر منداڵەکانیان، بەڵکو دایك و باوك و خێزان و کۆمەڵگەش ڕووبەڕووی کێشە و ئاستەنگەکانی ژیان دەبنەوە و زەرەرمەند دەبن، گرنگترین ئەو زیان و کێشە و ئاستەنگانەش بریتین لەمانەی خوارەوە:

- منداڵ بەشێوەیەکی ناتەندروست و بێ پلان و بەرنامە گەورە دەبێت.
- منداڵ بە هەڕەمەکی ژیان بەسەر دەبات.
- منداڵ بەهای کات و ژیان نازانێ و کاتێکی زۆر بەفیرۆ دەدات.
- منداڵ ناتوانێ لە کات و ساتی خۆیدا هەڵ و دەرفەتەکان بقۆزێتەوە.
- لە ئەرك و کارەکانیدا سەرکەوتن بەدەستناهێنێ.
- ناتوانێ کار و ئەرکەکانی خۆی ڕیزبەندی و پۆلێنبەندی بکات و لە ژیاندا ڕووبەڕووی کەمی کات و فرەکاری دەبێتەوە.
- بەهرە و تواناکانی منداڵ بە شێوەیەکی ئاسایی و سروشتی گەشە ناکات.
- ناتوانێ بەشێوەیەکی زانستییانە و بابەتییانە سوود لە توانا و بەهرەکانی خۆی وەربگرێت.
- ناتوانێ بە باشی ڕووبەڕووی پێشهات و ڕووداوە نەخوازراوەکان ببێتەوە.
- لە ژیاندا کەسێکی سەرکەوتوو نابێ.

- دایك و باوك و خێزان و کۆمەڵگە لە بەهرە و توانای ئەو جۆرە منداڵانە بێبەش دەبن.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە:

بۆ ئەوەی دایکان و باوکان لە ئەرك و کارەکانیاندا سەرکەوتوو بن و بتوانن نەوەیەکی زانا و دانا و بەتوانا و شارەزا و تێگەیشتوو و پێگەیشتوو پێشکەش بە کۆمەڵگە بکەن، دەبێ پلان و بەرنامەڕێژییان بۆ ژیان و پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانیان هەبێت، بۆ ئەم مەبەستەش دەبێ ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بهاوێژن:

- دەبێ دایك و باوك هەر لە دەستپێکی ژیانی هاوسەرگیرییەوە پلان و بەرنامەڕێژییان هەبێت بۆ ژیان، نەخاسمە بۆ پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانیان.
- دەبێ پلانەکە ورد وگشتگیر بێت.
- دەبێ پلانەکەیان ئامانجدار بێت و ڕۆشن و دیار بێت.
- دەبێ پلانەکەیان لەسەر بناغەیەکی زانستییانە و بابەتییانە دابڕێژن.
- دەبێ لەکاتی دانانی پلان، هەلومەرجی خودی و بابەتی لەبەرچاو بگیرێت.
- دەبێ پلانەکە قابیلی جێبەجێکردن بێت و ڕەنگدانەوەی واقعی خێزان بێت.
- دەبێ دایك و باوك جێبەجێکاری پلانەکە بن و ڕژدبن لەسەر جێبەجێکردنی.

- پێویستە دایك و باوك هاوسەنگی لە نێوان ئەرك و مافەكانی منداڵ بپارێزن.
- دەبێ پلانی دایك و باوك بۆ گەشەدان بێت بە توانا زەینی و هزری و زانستی و جەستەیەكانی منداڵ.
- پێویستە دایك و باوك بەشێك بن لە پلانەكە و لە خۆیانەوە دەستپێبكەن.
- دەبێ لە كاتی دانانی پلان، ڕەچاوی دۆخی منداڵ بكرێت و بەپێی قۆناغەكانی گەشەكردنی منداڵ بێت.
- دەبێ دایك و باوك، هەر لە سەرەتاوە هانی منداڵەكانیان بدەن بۆ گرنگیدان بە پلان و دانانی پلان بۆ كارەكانیان، هەروەها ئەركی چاودێری و بەدواداچوونی پلانەكەشیان بگرنە ئەستۆ.
- دەبێ لە جێبەجێكردن و جێبەجێنەكردنی پلانەكەدا پاداشت و سزا هەبێت، بۆ ئەوەی سزادراو خۆی ڕاستكاتەوە و پاداشتكراویش زیاتر هان بدرێت.
- پێویستە پلانی دایك و باوك و منداڵەكانیان، وەڵامدەرەوەی خواستەكانیان بێت.

## بێبەشکردنی منداڵ لە شیری دایک(سروشتی)

پزیشکان و پسپۆڕانی بواری منداڵان، شیری دایک(سروشتی)، بەباشترین شیر دەژمێرن، چونکە لە گشت شیرەکانی دیکە گونجاوترە بۆ منداڵ، هەروەها پێکهاتەکەیشی زۆر دەوڵەمەندە بەو ماددانە، کە پێویستن بۆ گەشەی منداڵ و پاراستنی لە هەموو جۆرە نەخۆشییەکان.

مخابن! یەکێك لەو هەڵانە، کە باوان بە گشتی و دایك بەتایبەتی دەرهەق بە منداڵ دەیکات، بێبەشکردنی منداڵە لە شیری خۆی.

ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- کارکردنی ئافرەت لە دەرەوەی ماڵەوە و بردنی منداڵ بۆ داینگە، یان سپاردنی بە کەسێکی دیکە.
- هەبوونی ترس لەوەی جوانی خۆی لەدەست بدات.
- بەهۆی ئازاری جەستەیی، نەنووستن و شەکەتی.
- هەندێ پیاو، ڕێگرن لە شیرپێدانی دایك بە منداڵ، بۆ ئەوەی کاتێکی زیاتر لەگەڵ هاوسەرەکانیان ببەنەسەر و پشتگوێ نەخرێن.
- هەبوونی کێشەی خێزانی لە نێوان پیاو و ژن.
- دووری دایك لە منداڵ، بەهۆی گرتن یان دوورخستنەوە یان سەفەرکردنی بۆ دەرەوەی وڵات.
- نەخۆشکەوتنی دایك.

ئەڵبەتە دایك ئەگەر دڵسۆز بێت و بەرژەوەندی منداڵەکەی لەبەرچاو بگرێت، نابێ بەبێ هەبوونی پاساوێکی یاسایی و شەرعی، شیر لە کۆرپەکەی ببڕێت، چونکە شیری دایك، هەم مافە، خودای مەزن بە

منداڵی بەخشیوە، هەمیش سەرچاوەیەکی سەرەکیی ژیانە بۆ منداڵ، سەرەڕای ئەوە، هیچ شیرێکی دیکە شوێنی ئەو شیرە ناگرێتەوە و نابێتە جێگرەوەی شیری دایك و قەرەبووی ناکاتەوە، بۆیە کەس، بە دایکی منداڵیشەوە،مافی ئەوەی نییە ئەو مافە ڕەوایە لە منداڵ بسەنێتەوە.

بێگومان منداڵ لە شەش مانگی یەکەم، تا دوو ساڵی تەواو دەکات، زۆر نیازمەندی شیری دایکە، چونکە شیری دایك لە گرنگییەکی زێدە بەهرەمەندە و زۆر پێویستە بۆ منداڵ، تاکو پێداویستییە جەستەیی و سۆزداری و ژیری و هزرییەکانی خۆی پێ دابین بکات.

بەڵگە زانستییەکانی ئەم سەردەمەش ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن کە شیری دایك(سروشتی)، زۆر باشترە لە شیری ناسروشتی و دەستکرد. بۆ نموونە رێکخراوی(یونیسێف)، کە سەر بە نەتەوەیەکگرتووەکانە و تایبەتە بە بواری منداڵانەوە، جەخت لەسەر ڕاستیی بایەخ و گرنگی شیری (دایك) دەکاتەوە و، پێی وایە هاندانی جیهانی سێیەم بۆ شیردانی سروشتی بە کۆرپە، ساڵانەگیانی نزیکەی ملیۆن و نیوێك منداڵ لە مردن رزگار دەکات.

## زیانەکانی بێبەشکردنی منداڵ لە شیری دایك

ئەڵبەتە،کاتێ منداڵ لە شیر دایك بێبەش دەکرێ، ڕووبەڕووی زیانێکی زۆر دەبێتەوە، کە لە چەند خاڵێکدا چڕ دەکەینەوە:

- لــە ڕووی گەشــەی جەســتەیی و هــزری و زانســتی و دەروونییــەوە ڕووبەڕووی کێشە دەبێتەوە و وەك پێویست گەشە ناکات.
- زانایان پێیان وایە لە ١٣% مردنی منداڵ، بۆ پێنەدانی شیری دایك و بەدخۆرکی دەگەڕێتەوە.
- دەبێتە هۆی بیرکۆلی و کەم زەینی وگەشەنەکردنی مێشك.
- دەبێتە هۆی قەڵەوی و زیادکردنی کێش.
- تووشبوون بە نەخۆشی ڕەبۆ.
- بێبەشبوونی منداڵ لە پێکهاتە سەرەکییەکانی خۆراك.
- کەمی بەرگری لەش و کەمی ماددەی ئاسن.
- کەمی ئەنزیم و هۆرمۆنەکان.
- تووشبوون بە نەخۆشی شەکرە و شێرپەنجە.
- بێبەشبوونی منداڵ لە سۆز و خۆشەویستی دایك.
- باری سەر شانی دایك و باوك قورس دەکات، چونکە دابینکردنی شیری دەستکرد،پێویستی بە پارەیەکی زۆر هەیە.

**چارسەرکردنی ئەم هەڵەیە:**

پێویستە لەسەر باوان، لەسەر ئەوە ڕێکبکەون کە (شیردان)، یەکێکە لە مافە سەرەکییەکانی منداڵ، بۆیە دەبێ بڕیار بدەن کە ئەو مافە بۆ منداڵ مسۆگەر بکەن و لە شیری دایك بێبەشی نەکەن، تاکو لە نەخۆشییەکان بەدوور بێت و بەشێوەیەکی سروشتی و تەندروست گەشە بکات و بتوانێ بۆ خۆی و کۆمەڵگەکەی کەسێکی سوودبەخش بێت و

لە گشت کایەکانی ژیان دا ئەسپی خۆی تاو بدات، چونکە شیری دایك ئەم سوود و قازانجانەی بۆ منداڵ هەیە:

- شیرێکی سروشتی و خۆڕسکە.
- پڕە لە پرۆتین و ڤیتامین و ئاسن.
- شیرێکی ساز و ئامادەیە.
- شیرێکی لەبار و گونجاوە.
- شیرێکی تەندروستە.
- پلەی گەرمی شیرەکە مامناوەندییە، نە زۆر گەرمە نە زۆر ساردە.
- شیری دایك، سۆز و خۆشەویستی لە نێوان دایك و کۆرپەکەیدا زیاد دەکات(د.حنان:٢٠٠١).
- شیری دایك پاك و خاوێنە(د.حنان:٢٠٠١).
- شیری دایك لەبەردەستە و بەئاسانی و لە هەر کات و ساتێك ویستمان دەستمان دەگاتێ (د.حنان:٢٠٠١).
- شیری دایك هەرزانترین شیرە لە ڕووی تێچوونەوە (د.حنان:٢٠٠١).
- شیرەکە هەردەم نوێ یە، بۆیە دوورە لە ئەگەری ئاڵۆدەبوون بە میکرۆب (د.حنان:٢٠٠١).
- شیری دایك بۆ هەرسگردن ئاسانە (د.حنان:٢٠٠١).
- شیری دایك ڕێگرە لەبەردەم قەڵەوبوونی دایك و کۆرپە (د.حنان:٢٠٠١).

- شیری دایك بە گوێرەی گەشەکردنی منداڵ، بەردەوام لە زیادبوون دایە و زیاد دەکات(د.حنان:۲۰۰۱).
- شیری دایك لە کەرەستە پێویستەکان پێکهاتووە، کە یارمەتی گەشەکردنی مێشك و دەزگای دەماری منداڵ دەدات، ئەم گەشەکردنەش پێش لە دایکبوونی منداڵ دەستپێدەکات و ٧٥% گەشەکردنی خۆی لەو دوو ساڵەدا تەواو دەکات(د.حنان:۲۰۰۱).
- شیری(دایك)، دوای لە دایکبوون، یارمەتی (رەحم)ی دایك دەدات، تاکو بگەڕێتەوە ئاستی سروشتی خۆی، واتە پێش سکپڕی، هەروەها دەپارێزێ لە ئەگەری تووشبوون بە خوێنبەربوون (نزیف)ی دوای لە دایکبوونیش (محمدالسید الزعبلاوی:١٩٨٤).
- شیری دایك یەك جۆرە شیرە و ئەم شیرە بۆ گشت قۆناغەکانی شیردان گونجاوە، بەڵام شیری دەستکرد، فرە جۆرە و هەر شیرێك لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی شیردان دەدرێ بە منداڵ.
- منداڵەکە بەهۆی شیری دایکییەوە، لە زۆرێك لە نەخۆشییەکان پارێزراو دەبێت.

## هەڵبژاردنی ناوێکی خراپ و بێ واتا بۆ منداڵ

ناو بۆ هەر کەسێك، دەبێتە ناسنامە و شوناس، بۆیە ئەرکی دایك و باوکەکانە ناوێکی خۆش و جوان و واتادار بۆ منداڵ هەڵبژێرن، ئەڵبەتە ئەم کارە بۆ دایك و باوکی منداڵ دەبێتە ئەرك، بەڵام بۆ خودی منداڵەکە دەبێتە ماف، چونکە منداڵ مافی خۆیەتی ناوێکی خۆش و جوان و واتاداری هەبێت و لە ئایندەدا شانازیی پێوە بکات و نەبێتە هۆکارێك بۆ ئەوەی لە ناو هاورێ و دۆست و خزم و کەسەکانیدا لەکەدار ببێت و هەست بە شەرمەزاری بکات.

بەداخەوە هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان دەیکەن، هەڵبژاردنی ناوێکی ناخۆش و ڕەشبین و بێ واتایە بۆ منداڵ، لەسەرەتای لەدایك بوونیدا، وەك ناوی نەزان، خەمبار، کەسەر، بێوار، چیچۆ، مشکۆ، جگەرخوێن، دڵبرین، کۆڤان،و جەنگی و شەڤین و نەشاد و...تاد.

ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- ناوشیاری و بێئاگایی.
- نەزانین و کەم ئەزموونی.
- خەمساردی و بێباکی.
- چاولێکەری و لاساییکردنەوەی ئەوانی دیکە.
- هەست نەکردن بەبەرپرسیارەتی و...تاد.
- خۆسەپاندن و تاکڕەوی.
- ئاشنا نەبوون بە مافەکانی منداڵ.
- پێشێلکردنی مافەکانی منداڵ.

ئەڵبەتە هەڵبژاردنی ناوێکی ناخۆش بەهەر پاساوێك بێت، هەڵەیەکی کوشندەیە، دەبێ دایکان و باوکان خۆیان لە ئەنجامدانی ئەو هەڵەیە بپارێزن، چونکە بەبەڵگەی زانستی سەلمێندراوە کە ناوی ناخۆش و بێ واتا و ناشیرین، کاریگەرییەکی نەرێنی لەسەر دڵ و دەروون و کەسایەتی منداڵ دروست دەکات، بەتایبەتی لە ناو ڕەفیق و هەڤالانیدا، هەر لە باخچەی ساوایان و قوتابخانەوە بگرە، تا کۆلان و شوێنە گشتییەکان وگۆڕەپانەکانی یاری و ناو کۆڕ و کۆبوونەوە و خەڵك و کۆمەڵگە و...تاد، گرنگترین ئەو زیان و کاریگەرییە نەرێنییانەش لە چەند خاڵێکدا چڕدەکەینەوە:

- منداڵ هەست بە نائاسوودەیی دەروونی دەکات.
- شەرم لەناوی خۆی دەکاتەوە.
- بڕوا و متمانەی بە خۆی نابێت.
- مرۆڤێکی ڕەشبین دەبێت.
- خەڵك و کۆمەڵگە بەگشتی، بە چاوێکی سووك سەیری دەکەن.
- زۆرجار رق و قینە دروست دەکات.
- هاندەرێکە بۆ کاری خراپ.
- هۆکارێکە بۆ گۆشەگیری و دوورەپەرێزی.
- فاکتەرێکە بۆ تووڕەیی و هەڵچوون.
- هەست بە کەموکوڕی دەکات.
- کەسێکی ورە ڕووخاو دەردەچێت.
- بە هەستیارییەوە دەڕوانێتە قسەی رەفیقەکانی و خەڵك.

**چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە:**

پێویستە باوان بە ئەرکی سەرشانی خۆیان هەڵبستن و ئەم مافە رەوایە، کە مافی (ناولێنانە)ە و، خودای دلۆڤان بە منداڵی بەخشیوە، پێشێلی نەکەن و ناوێك لە منداڵ بنێن، کە لە ئایندەدا سەری پێ بەرزبێتەوە و نەبێتە لەکەیەکی رەش بە نێوچەوانی خۆی و دایك و باوکییەوە، چونکە ناوی خۆش و واتادار ئەم سوود و قازانجانەی بۆ منداڵ هەیە:

- منداڵ شانازی بەناوی خۆیەوە دەکات و لەناو هەڤاڵ و هاورێکانیدا سەری بەرزە.
- کاریگەرییەکی ئەرێنی لەسەر ناخ و دەروونی جێدێڵێت.
- رووبەرووی گاڵتەپێکردن نابێتەوە.
- بەهۆی ناوەکەیەوە دوورەپەرێز و گۆشەگیر نابێت.
- کەسێکی هەستیار نابێت و سینەفراوان دەبێت.
- کاریگەرییەکی ئەرێنی لەسەر پەیوەندییەکانی منداڵ و دایکان و باوکان جێدێڵێت.
- کەسێکی گەشبین و خۆشبین دەبێت.

## هاوڕێیەتی نەکردنی منداڵ

هەبوونی هاوڕێیەتی و پەیوەندییەکی دۆستانە لە نێوان دایک و باوک و منداڵەکانیان، گرنگییەکی فرە زۆری هەیە، چونکە ئەم پەیوەندییە دەبێتە هەوێنی سۆز و خۆشەویستی لە نێوانیاندا.

بەڵام مخابن! زۆرێك لە دایکان و باوکان پەی بەو ڕاستییە نابەن و ناچنە ناو بازنەی هاوڕێیەتی و دۆستایەتییەوە و لە دەرەوەی ئەو بازنەیە دەخولێنەوە!

بۆیە هەڵەیەکی دیکە، لەو هەڵە باوانەی کە باوان دەرهەق بە منداڵەکانیان دەیکەن، بریتییە لە فەرامۆشکردنی هاوڕێیەتی منداڵ، واتە پەیوەندییەکانیان تەنیا لە چوارچێوەی بازنەی دایکایەتی و باوکایەتیدا دەمێنێتەوە و هاوڕێیەتی منداڵەکانیان ناگرێتەوە.

ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- هەبوونی ناکۆکی و کێشە و بگرە و بەردەی خێزانی.
- نزمی ئاستی ڕۆشنبیری و زانستی دایك و باوك.
- هەست نەکردن بە بەرپرسیارەتی.
- بێبەشبوونی دایك و باوك لە سۆز و خۆشەویستی باوانیان لەسەردەمی منداڵیدا.
- ئاشنانەبوون بە شێوازگەلی پەروەردەیی و زانستی.
- هەبوونی گرێی دەروونی.
- پابەندبوون بە نەریتە باوەکانی ناو کۆمەڵگە.
- گەورەبوون لە ناو ژینگەیەکی توندوتیژ و ئاڵۆزدا.
- چاولێکەری و لاساییکردنەوە.

ئەڵبەتە بەرپرسیارەتی نەبوونی هاوڕێیەتی لە نێوان دایکان و باوکان و منداڵەکانیان، زیاتر لە ئەستۆی دایکان و باوکان دایە و دەبێ ئەوان ئەم بەرپرسیارەتییە لە ئەستۆ بگرن و تەحەمولی دەرەنجامە خراپەکانیشی بکەن، چونکە ئەوان نەیانتوانیوە تۆوی هاوڕێیەتی و سۆز و خۆشەویستی لەناو کێڵگەی خێزاندا بروێنن، بۆ ئەوەی هەمووان لە بەروبوومەکەی بخۆن و بە بەختەوەری و ئاسوودەیی بژین و دووربن لە هەموو کار و هەڵسوکەوتێکی نابەجێ و نەخوازراو.

ئەڵبەتە زانا دەروونناسەکان پێیان وایە کە هاوڕێیەتی بەشێوەیەکی گشتی دەبێتە هۆی گەشەکردنی منداڵ لە ڕووی دەروونی و کۆمەڵایەتی و جووڵەکردنەوە، هەروەها وا دەکات کەوا منداڵ هەست بە دوورەپەرێزی و گۆشەگیری نەکات و کەسێکی کۆمەڵایەتی بێت و هەست بە ترس و شەرمنی و ترسی چوونە ناو کۆمەڵگە نەکات و زیاتر پشت بەخۆی ببەستێت و بە بڕوابەخۆبوونەوە ڕووبەڕووی کێشە و ئارێشەکانی ژیان ببێتەوە.

هەروەها زانایانی بواری پەروەردەش پێیان وایە هەبوونی پەیوەندی بەشێوەیەکی گشتی وادەکات کەوا منداڵ فێرە هاوکاری و کاری دەستەجەمعی ببێت و کەسایەتییەکی بەهێزی هەبێت و لەکاتی گەمە و یاریکردندا لە چەمکی هاوبەشی و هاوکاری و هەماهەنگی و هاوسەنگی و بەخشندەیی و قوربانیدان تێبگات و ئامادەباشییەکی زیاتری هەبێت بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ ژینگەی ماڵە و قوتابخانە و کۆمەڵگە.

## زیانەکانی هاوڕێیەتی نەکردنی منداڵ

هاوڕێیەتی نەکردنی منداڵ لەلایەن دایك و باوکییەوە، هەر تەنیا زیان بە منداڵ ناگەیەنێت، بەڵکو دایك و باوك و خێزان و کۆمەڵگەش لێی زەرەرمەند دەبن، گرنگترین ئەو زیانانەش ئەمانەی خوارەوەن:

- منداڵ هەست بە نامۆیی و تەنیایی دەکات، بەتایبەتی لە ماڵەوە.
- منداڵ لە سۆزی هاوڕێیەتی دایك و باوك بێبەش دەبێت.
- منداڵ لە دایك و باوکییەوە فێرە فەرمانکردن و خۆسەپاندن و تاکڕەوی دەبێت.
- منداڵ ناتوانێ دەردی دڵی خۆی بۆ دایك و باوکی باس بکات و کلیلی نهێنییەکانی ڕادەستی ئەوان بکات.
- منداڵ دەکەوێتە ژێر یاسای (ئەفسەر و سەرباز)وە، واتە دەرفەتێکی ئەوتۆ بۆ دان و ستاندن و گفتوگۆ نامێنێتەوە و هەر ئەمر و فەرمانێك لەلایەن دایك و باوکی منداڵەوە دەربچێت، ئەو وەك سەربازێك بێ سێ و دوو دەبێ جێبەجێ بکات.
- منداڵ دووچاری گۆشەگیری و دوورەپەرێزی دەبێت.
- منداڵ بۆ قەرەبووکردنەوەی سۆز و خۆشەویستی و هاوڕێیەتی دایك و باوکی، ڕوو لە دەرەوە دەکات و زۆرجار دەبێتە ڕەفیقی کەسانی لاسار و یاخی و سەرەڕوو.

## چارەسکردنی ئەم هەڵەیە

پێویستە دایکان و باوکان هەر لەسەرەتاوە پەیوەندییەکی دۆستانە و توندوتۆڵ لەسەر بناغەی سۆز و خۆشەویستی و ڕێزگرتن لەگەڵ

منداڵەکانیان دروست بکەن و گوێیان لێبگرن و دەرفەتی ئەوەیان پێ بدەن گوزارشت لە ڕاو بۆچوونی خۆیان بکەن و خاوەن شوناسی کەسایەتی خۆیان بن، هەروەها هانی منداڵەکانیان بدەن بۆ ئەوەی پەیوەندییەکی پتەو و دۆستانە لەگەڵ کەسوکاریان هەبێت، چونکە هەبوونی ئەم جۆرە پەیوەندییە سوودێکی زۆری دەبێت بۆ خودی دایکان و باوکان و منداڵان و تەنانەت کۆمەڵگەش، گرنگترین ئەو سوودانەش ئەمانەن:

- منداڵ هەست بە ئاسوودەیی دەروونی دەکات.
- دەردی دڵی خۆی لای دایك و باوکی باس دەکات و نهێنییەکانی خۆی لێیان ناشارێتەوە.
- فێرە زۆر بەهای مرۆڤی و کۆمەڵایەتی دەبێت، وەك: بەهای دڵسۆزی و قوربانیدان و لێبوردەیی و بەخشین و هاوکاری و هەماهەنگی و پرس و ڕاوێژ و کاری هەرەوەزی و...تاد.
- لە گۆشەگیری دووردەکەوێتەوە.
- کێشەکانی خۆی لە ڕێگەی دان و ستاندن و هەڤپەیڤینەوە چارەسەر دەکات.
- لە خۆسەپاندن و تاکڕەوی دوور دەکەوێتەوە.

## بەکارهێنانی توندوتیژی بەرامبەر بە منداڵ

توندوتیژی، دەردێکی کوشندە و مەترسیدارە، بەتایبەتی توندوتیژی خێزانی، چونکە پەل دەهاوێژێ و هەمو کۆمەڵگە بەدەستییەوە گرفتار دەبێت.

ئەڵبەتە هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە کوشندانەی کە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە بەکارهێنانی توندوتیژی جیاجیا دژ بە منداڵ، چونکە توندوتیژی، توندوتیژی بەرهەمدێنێ، بۆیە هەر کەسێك تۆوی توندوتیژی لەناو کێڵگەی خێزاندا بڕوێنێ، دەبێ بەیانی تەندوتیژی و شەڕەنگێزی بدورێتەوە و تەحەمولی ئەنجامە نەرێنی و خراپەکانیشی بکات، جا ئەو کەسە دایك یان باوك یان هەردووکیان، یاخود هەر ئەندامێکی دیکەی خێزان بێت.

بێگومان بەکارهێنانی ئەم توندوتیژییەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- هەبوونی کێشە و بگرە و بەردەی خێزانی.
- هەبوونی گرێی دەروونی.
- هەبوونی ژینگەیەکی ناتەندروست و توندوتیژ لەسەردەمی منداڵیدا.
- پەنگخواردنەوەی ڕق و قینە.
- دەستتەنگی و هەژاری.
- ئاشنانەبوون بە شێوازە پەروەردەیی و زانستییەکان.
- بیرکردنەوەی هەڵە و چاولێکەری.
- گۆشەگیری و لاوازی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان.

● لاوازی کەسۆکی.

ئەڵبەتە یەك جۆرە توندوتیژی نییە، بەڵکو توندوتیژییەکان فرە جۆرەن، کەگرنگترینیان ئەمانەن:

### ١. توندوتیژی جەستەیی:

-لێدان، بەهۆی دەست، پێلاقە، دار، بەرد، چەقۆ و و تفەنگ و...تاد.

- قژ(پرچ) و گوێ ڕاکێشان.

-بەردانەوە و بەعەرزیدادان.

-سەر و دەم و چاو، یان دەست و پێ شکاندن.

-بریندارکردن بە وەسیلەی جیاجیا.

-ددان شکاندن.

-نووشتاندنەوە(ڤەقراندن)ی پەنجەکان و دەست و بازوو.

-قنجرکە لێدان.

-خستنە ناو کەند، یان چاڵەوە.

-کوشتن بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ.

### ٢. توندوتیژی (زارەکی — دەروونی):

-جنێوپێدان.

-سووکایەتیپێکردن.

-تف لێ کردن.

-تۆمەت بۆ هەڵبەستن و بوختان پێکردن.

-ڕیسواکردن بەرامبەر هەڤالانی و مامۆستایانی.

-هەڕەشە و گەف لێکردن.

-بێبەشکردن لە یاری و گەمەی بەکۆمەڵ و دەستەکۆیی.

**٣. توندوتیژی ماددی:**

- بێبەشکردن لە پارەو پووڵ.
- دەستگرتن بەسەر کەلوپەلەکانیدا.
- دڕاندن و شکاندنی کەلوپەلەکانی.
- لێسەندنەوەی کەلوپەلەکانی تایبەت بەخۆی.

**زیانەکانی توندوتیژی:** بێگومان بەکارهێنانی توندوتیژی، زیانی هەر تەنیا بۆ منداڵەکە نییە، بەڵکو بۆ خێزان و کۆمەڵگە و نیشتمانیشە. گرنگترین ئەو زیانانەش ئەمانەن:

- ئەگەرێکی زۆر هەیە منداڵ لە ئایندەدا ببێتە کەسێکی توندوتیژ و شەڕەنگێز و کاری توندوتیژی ئەنجام بدات.
- منداڵ چاو لە دایك و باوکی دەکات و دەبێتە چاولێکەرێکی نەرێنی.
- منداڵ نابێتە کەسێکی ئەرێنی و سوودبەخش.
- منداڵ هەست بە خۆکەمزانین دەکات و ناتوانێ پشت بە تواناکانی خۆی ببەستێت.
- منداڵ هەمیشە هەست بە دڵتەنگی و خەمۆکی دەکات.
- منداڵ ڕووبەڕووی گۆشەگیری و دوورەپەرێزی دەبێتەوە.
- منداڵ ناتوانێ بەرگری لە مافەکانی خۆی بکات.
- لە ژیاندا سەرکەوتوو نابێت.

- هەستی تۆڵەسەندەوە لە ناخی منداڵدا بەهێز دەکات.
- منداڵ دەبێتە کەسێکی قین لە دڵ و عینادی.
- منداڵ دەبێتە کەسێکی ڕەشبین و وا دەزانێت بۆ هەر چارەسەرێك کێشەیەك هەیە!
- لەکاتی سەرهەڵدانی هەر کێشەیەك، لەبری دان و ستاندن و گفتوگۆ، پەنا بۆ خۆسەپاندن و تاکڕەوی و ملشکاندنی ئەوانی دیکە دەبات.

### چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە:

ئەڵبەتە بەکارهێنانی توندوتیژی دژبەری منداڵ، زیانێکی زۆری جەستەیی و ژیری و هزری و زانستی و کۆمەڵایەتی لێدەکەوێتەوە و کاریگەرییەکی نەرێنی و خراپ لەسەر کەسایەتی منداڵ جێدێڵێت، بۆیە دەبێ دایك و باوك لە ئاست ئەو بەرپرسیارێتییە دابن کە لە ئەستۆیان دایە و لەکاتی سەرەدەریکردن لەگەڵ منداڵەکانیاندا، خۆیان لە هەموو جۆرە توندوتیژییەك بەدوور بگرن و هەوڵدەن بە شێوەیەکی زانستی و پەروەردەیی و لە ڕێگەی دان و ستاندنەوە کێشەکانیان چارەسەر بکەن، چونکە ئەوەی مرۆڤ بە ئاشتی و خۆشی بەدەستی دەهێنێ، بە شەڕ و توندوتیژی چنگی ناکەوێت و ڕەنج بەبا دەبێت، هەروەها پێویستە هەردوولا پەیڕەوی لە یەك جۆرە شێوازی پەروەردەکردن بکەن و بە پێچەوانی شەپۆلی یەکتر مەلە نەکەن، چونکە بەزیانی خودی ئەوان و منداڵەکانیشیان دەشکێتەوە و لە ژیاندا سەرکەوتوو نابن.

بۆ دوورکەوتنەوە لە توندوتیژی، پێویستە ئەم خاڵانە جێبەجێ بکەن:

- پێویستە دایکان و باوکان هەوڵدەن، ببن بەدۆست و هاوڕێی گیانی بەگیانی لەگەڵ منداڵەکانیان، بۆ ئەوەی ژیانیان لە ئاڵۆزی و شەپرزەیی و شڵەژان بەدوور بێت.
- پێویستە دایکان و باوکان خۆشەویستی خۆیان لە هەموو شتێکی دیکە زیاتر بە منداڵەکانیان ببەخشن.
- پێویستە دایك و باوکەکان، لە کاتی پەیڤین، بە زمانی گوڵ قسە بکەن، نەك زمانی دڕك.
- پێویستە خۆیان لە هەموو جۆرە توندوتیژییەك بپارێزن، جا کەم بێت یان زۆر، ماددی بێت یان جەستەیی و دەروونی.
- دەبێ خۆیان لە زوو تووڕە بوون و زوو هەڵچوون بپارێزن، بەتایبەتی لە کاتی سەرهەڵدانی کێشە و قەیرانەکان، بۆ ئەوەی بڕیاری هەڵە و بەپەلە نەدەن.
- دەبێ زانایانە و ژیرانە بڕیار بدەن.
- دەبێ بە شێوازێکی زانستییانە و پەروەردەیانە سەرەدەری لەگەڵ ڕووداو و پێشهاتەکانی ژیان بکەن.
- دەبێ بزانن کە زیانەکانی توندوتیژی قەرەبوو ناکرێنەوە.
- دەبێ هەڵە بە هەڵە چارەسەر نەکەن.
- دەبێ ئاشنابن بە مافەکانی منداڵ و پارێزەری مافەکانی بن.
- دەبێ هەمیشە لە جیاتی فەرمانکردن و دەمەتەقێ و بۆڵە بۆڵ، پەنا بۆ دان و ستاندن و گفتوگۆیەکی هێمنانە ببەن.
- دەبێ نەهێڵن کێشەکان کەڵەکە ببن و زوو زوو چارەسەر بکرێن.

- دەبێ خۆیان لە هەڵەکردن بپارێزن، بۆ ئەوەی بتوانن داوا لە منداڵەکانیان بکە کە هەڵە نەکەن و قسەکانیان کاریگەر بن.
- دەبێ ڕێز لە مافەکانی مرۆڤ و منداڵ بگرن و پێشێل نەکەن.
- دەبێ هەڵەکانیان دووبارە و چەندبارە نەکەنەوە.
- پێویستە دانبەخۆداگر و سینگفراوان بن.
- دەبێ بەخشەر و لێبوردە بن

## بەراوردکردنی منداڵ بەکەسانی دیکە

بەراوردکردنی منداڵ بە منداڵێکی دیکە، جا چ لەلایەن دایک و باوک یان مامۆستاوە بێت، هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە هیچ منداڵێک لە ڕووی جەستەیی و هێزی و زانستی و دەروونی و تەنانەت کۆمەڵایەتیشەوە، بە منداڵێکی دیکە ناچێت.

بۆیە هەڵەیەکی دیکەی دایکان و باوکان، کە دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە بەراوردکردنیان لەگەڵ منداڵانی دیکە، لە هەموو ڕوویەکەوە.

ئەڵبەتە ئەم جۆرە بەراوردکردنە تا سەرئێسقان کارێکی نابەجێ و نازانستی و ناپەروەردەیی و نالۆژیکییە، چونکە هەر منداڵێک تایبەتمەندی خۆی هەیە و هەڵگری کۆمەڵێک خەسڵەت و بەهرەی جیاوازە، بۆیە ناکرێ منداڵێک لەگەڵ منداڵێکی دیکە بەروارد بکرێت، یاخود دایک و باوک چاوەڕوانی ئەوە لە منداڵ بکەن کە وەك منداڵی فلان و فیسار زیرەك بێت، یاخود بلیمەت بێت یان چوست و چەلەنگ و بەفام بێت.

بۆیە بە پێویستی دەزانم لەسەر ئەم بابەتە، ئاماژە بە بەسەرهاتێکی پەندئامێز بکەم، کە لە مێژوودا تۆمار کراوە.

دەگێڕنەوە:"ڕۆژێك لە ڕۆژان باوکێك دەچێتە ژووری کوڕەکەی، ئەویش خەریکی توێژینەوە دەبێ لەسەر ژیان و سەرکەوتنەکانی ناپلیۆن!

باوك: كوڕم دەزانی كاتێ كـە ناپلیۆن قوتابی بوو، هەمیشە لەسەر ئاستی پۆلەكەی بە یەكەم دەردەچوو! هەرگیز وەک وەك تۆ نەدەبوو بە پێنجەم؟!

كوڕە ژیـرەكەی وەڵامـی بـاوكی دایـەوە و گـوتی: بابـەگیان كـاتێ ناپلیۆن گەیشتە تەمەنی تۆ، وەك تۆ نەبوو بە فەرمانبەرێكی ئاسایی لە یەكێك لە كۆمپانیاكان"!!!! بەڵكو بوو بە ئیمبراتۆری فەرەنسا!!

ئەم بەسەرهاتە فێرمان دەكات كەوا نابێ باوكان و دایكان،هیچ كـاتێ منداڵـەكانیان بـە منـداڵانی دیكـە بچـوێنن، چونكـە هـەر منـداڵێك تایبەتمەندی خۆی هەیە و توانای كەسێك بۆ كەسێكی دیكە جیاوازە و دەبێ تایبەتمەندییە هزری و زانستی و جەستەیەكانی لەبەرچاو بگیرێن و ڕەچاوی جیاتاكی منداڵان بكرێت، لەگەڵ ئەو ژینگەیەی كە تێدا گەورە دەبێت.

ئەم بابەتە وەك ئەوە وایە مرۆڤ دوو جۆرە میوە بە یەك بچوێنێت! بۆ نموونە سێو و خۆخ! كە هەر كامیان لە ڕەنگ و شێوە و قەبارە و تام و ڤیتامین و سوودەكانیان لێك جیاوازن و هەر كامیـان تایبەتمەندی خۆی هەیە.

بەڕاستی ئەم هەڵەیە بۆ چەند هۆكارێكی جیاجیا دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- هەبوونی چاوەڕوانییەكی زیاد لە منداڵ.
- هەبوونی خوێندنەوەیەكی هەڵە بۆ منداڵ.
- ناوشیاری و بێئاگایی دایك و باوك.
- ئاشنانەبوون بە شێوازە زانستی و پەروەردەیەكان.
- هەستی خۆبەكەمزانین.

- ئاشنانەبوون بە قۆناغەکانی گەشەکردنی منداڵ.
- نزمی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری دایك و باوك.
- چاولێکەری و لاساییکردنەوە.

ئەڵبەتە بەردەوام بوون لەسەر ئەم هەڵەیە، ئەم زیانانەی خوارەوە بەدوای خۆیدا دێنێت:

- منداڵ هەست بە خۆبەکەمزانین دەکات و وا هەست دەکات کە لە کەسانی دیکە لاوازترە.
- کوشتنی بەرزخوازی لە ناخی منداڵدا.
- پاڵ بە منداڵانەوە دەنێ کەوا دەرهەق بە کەسانی دیکە حەسادەتیان هەبێت.
- بەهرە و تواناکان لە منداڵدا دەکوژێت.
- منداڵ وا بار دێت کە پشت بە خۆی نەبەستێت و چاوی لەم و لەو بێت.
- منداڵ دەکەوێتە ژێر فشارێکی توندی دایك و باوك، تاکو لاسایی ئەم و ئەو بکاتەوە.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

پێویستە هیچ کاتێ دایکان و باوکان، منداڵەکانیان لەگەڵ منداڵانی خەڵکانی دیکە بەراورد نەکەن و چاوەڕوانی ئەوەش لە منداڵەکانیان نەکەن، کە ببنە کۆپی منداڵانی ئەم و ئەو، چونکە ئەم کارە نەك هەر سوودیان پێناگەیەنێت، بگرە زیانیشی هەیە و بەهرە و تواناکانی منداڵ دەکوژێ و نە سوود لە توانا و بەهرەکانی خۆی

وەردەگرێت، نە وەك ئەویش دەردەچێت، جا بۆ ئەم مەبەستەش باشتر وایە دایکان و باوکان ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بهاوێژن:

- ڕێز لە تایبەتمەندی و بەهرە و تواناکانی منداڵەکانتان بگرن.
- کارێکی وا بکەن کە منداڵەکانیان بڕوا و متمانەیان بەخۆیان هەبێت و پشت بە تواناکانی خۆیان ببەستن.
- پێویستە لێگەڕێن، تاکو منداڵان بەخۆیان، کاری خۆیان بکەن و هەست بە بەرپرسیارەتی بکەن.
- هەوڵدەن بەهرە و توانا ڕاستەقینەکانی منداڵەکانیان بناسن و لە هەموو ڕوویەکەوە گەشەی پێ بدەن.
- هەوڵدەن توانا شاراوەکانی منداڵەکانیان بدۆزنەوە و گەشەی پێ بدەن.
- خوێندن لای منداڵەکانتان شیرین بکەن.
- بەدەر لە تواناکانیان، باری شانیان گران نەکەن.
- لەبری بەراوردکردنیان لەگەڵ ئەوانی دیکە، هانیان بدەن کەوا بەباشترین شێوە سوود لە بەهرە و توانا و کاتەکانیان وەربگرن و ڕەسەنایەتی خۆیان بسەلمێنن و نەبن بە کۆپی ئەم و ئەو.

## چاوەڕوانیکردنی دایک و باوک لە منداڵ بەدەر لە تواناکانی

توانای هەرکەسێك، بە منداڵیشەوە، سنووردارە، واتە هەر کەسێك توانا و هێزێکی سنووری داری هەیە و ناتوانێ هەموو سنوورەکان تێپەڕێنێ و هەر شتێکی گەرەکی بێت ئەنجامی بدات.

بەڵام مخابن! زۆرێك لە دایکان و باوکان، لەم ڕاستییە حاشا هەڵنەگرە تێناگەن، بۆیە ئەم هەڵەیە دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجام دەدەن و شتێك لە منداڵەکانیان دەخوازن، کە بەدەرێت لە تواناکانیان و نەتوانن جێبەجێی بکەن.

زۆر دایك و باوکی وا هەن زیاد لە ئەندازە چاوەڕوانییان لە منداڵەکانیان هەیە و گەرەکیانە لە هەموو کارێك، نەخاسمە لە بواری خوێندندا، پلەیەکی بەرز و شەهادەیەکی باڵا بەدەستبهێنن و لە کەسە هەرە باڵاکان و بلیمەتەکان بن! بۆیە فشارێکی زۆر دەخەنە سەریان، بەبێ ئەوەی هەڵسەنگاندنێکی زانستییانە و بابەتییانە و واقعبینانە بۆ توانا و بەهرەکانیان بکەن و بەبێ ئەوەی ڕەچاوی جیاتاکی بکەن و بزانن ئاخۆ منداڵەکانیان توانای ئەنجامدانی ئەو جۆرە کارانەیان هەیە یاخود نا؟!!!

هۆکاری ئەمەش بۆ چەند خاڵێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- ئاشنانەبوون بە تواناکانی منداڵ.
- نەخوێندەواری و نزمی ئاستی دایك و باوك.
- هەبوونی چاوەڕوانییەکی زیاد لە منداڵ.
- هەبوونی حەزی خۆسەپاندن و تاکڕەوی.
- هەبوونی حەزی خۆدەرخستن و ناوداری.

- ئاشنانەبوون بە بنەما زانستی و پەروەردەییەکان.
- ئاشنانەبوون بە قۆناغەکانی گەشەکردنی منداڵ.

ئەڵبەتە چاوەڕوانیکردنی دایك و باوك لە منداڵ بەدەر لە تواناکانی، زیانێکی زۆر بە منداڵ دەگەیەنێت،کە لەم چەند خاڵەدا دەخەینە ڕوو:

- منداڵ دووچاری نیگەرانی و دڵەڕاوکێ و شلەژانی دەروونی دەبێ.
- بڕوا و متمانەی بەخۆی نامێنێ و ناتوانێ پشت بەخۆی ببەستێت.
- دووچاری هیلاکی و شەکەتییەکی زۆری هزری و جەستەیی دەبێ.
- ناتوانێ ژیرانە بڕیاری خۆی بدات.
- هزری تۆڵەسەندنەوە لە دەروونیدا گەشە دەکات.
- فێرە درۆکردن دەبێ و پاساو بۆ بێ توانایی خۆی دەدۆزێتەوە.
- لە ئەرك و بەرپرسیارەتی ڕادەکات.
- هەست بە فشارێکی زۆری جەستەیی و دەروونی دەکات.
- نابێتە کەسێکی داهێنەر و ئافرندە.
- لە کارەکانیاندا سەرکەوتوو نەبێ.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

پێویستە دایك و باوکەکان، توانا و بەهرەکانی منداڵەکانیان بناسن و لە ژێر ڕۆشنایی ئەو ئاسینە سەرەدەرییان لەگەڵدا بکەن و فشار نەخەنە سەر منداڵ و باری شانی قورس نەکەن، تاکو لە ئەرك و کارەکانیاندا سەرکەوتوو بێ، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بهاوێژن:

- دەبێ دایك و باوك بەرپرسانە سەرەدەری لەگەڵ منداڵەکانیان بکەن.
- دەبێ بە شێوەیەکی زانستییانە و بابەتییانە و واقعبینانە سەرەدەری لەگەڵ منداڵ بکەن.
- دەبێ منداڵ بۆ دایك و باوك چەق بێت.
- پێویستە دایك و باوك بزانن توانای هەر منداڵێك سنووردارە، بۆیە نابێ بەدەر لەو توانایەی کە هەیەتی، لە منداڵ چاوەڕوان بکرێت.
- پێویستە دایك و باوك ڕێز لە بەهرە و توانا و تایبەتمەندییەکانی منداڵەکانیان بگرن و بەکەمی نەزانن.
- پێویستە هاوکاربن بۆ ئەوەی منداڵەکانیان پەی بە توانا شاراوەکانیان ببەن.
- پێویستە دایك و باوك وەك چرایەك بن بۆ ڕۆشنکردنەوەی گۆشە تاریکەکانی ژیانی منداڵەکانیان و کردنەوەی گرێ کوێرەکانیان.
- دەبێ دایك و باوك ڕێخۆشکەرن بۆگەشەدان بە توانا و بەهرەکانی منداڵەکانیان.

## بێبەشکردنی منداڵ لە سۆز و خۆشەویستی خۆیان

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان دەرهەق بەمنداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە بێبەشکردنی منداڵ لە سۆز و خۆشەویستی خۆیان، چونکە سۆز و خۆشەویستی کلیلی بەختەوەری تاك و کۆمەڵگەیە، هەر خێزان و کۆمەڵگەیەك لەسەر بناغەی سۆز و خۆشەویستی بنیادنەنرابێت، زوو یان درەنگ دەڕووخێ و هەڵدەوەشێتەوە و پەرتەوازە دەبێت.

مخابن زۆرێك لە دایکان و باوکان ئەم بابەتە بەهەند وەرناگرن و حەزە سۆزدارییەکانی منداڵەکانیان تێر ناکەن و فەرامۆشی دەکەن.

ئەڵبەتە دەروونناس و کۆمەڵناسەکان پێیان وایە سۆز و خۆشەویستی دایك و باوك، کاریگەرییەکی زۆری هەیە لەسەر کەسایەتی منداڵ، چونکە هەر وەك چۆن گوڵ پێویستی بە ئاو هەیە، تاکو سیس هەڵنەگەڕێ و وشك نەبێ، ئاوا منداڵیش پێویستی بە سۆز و خۆشەویستی و میهرەبانی دایك و باوك هەیە بۆ ئەوەی لە گشت ڕوویەکەوە گەشە بکات و بەشێوەیەکی تەندروست بێتە پەروەردەکردن و تێگەیاندن و پێگەیاندن و کەسایەتییەکی بەهێزی هەبێت و بتوانێ خۆی هەمبەر شەپۆڵە توندەکانی ژیان بگرێ و بە شێوەیەکی سەرکەوتوویانە کەشتی خۆی بگەیەنێتە کەناری ئارامی و بەختەوەری.

مخابن! هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵانەی کە زۆر دایك و باوك دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە بێبەشکردنی منداڵ لە سۆز و خۆشەویستی و میهرەبانی خۆیان.

ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- هەبوونی کێشە و بگرەوبەردەی خێزانی.
- هەبوونی گرێی دەروونی.
- هەبوونی ڕق و قینە و دڵڕەقی و خۆبەزلزانی.
- بێبەشبوونی دایك و باوك لە سۆز و خۆشەویستی باوانیان
- سەرقاڵبوونی دایك و باوك بە کاری ڕۆژانەی خۆیان وفرەکاری و...تاد.
- ئاشنانەبوون بە بنەما زانستی و پەروەردەیەکان.
- گەورەبوونی دایك و باوك لە ژینگەیەکی توندوتیژدا.
- ئاشنانەبوون بە مافەکانی منداڵ.

بێگومان بێبەشکردنی منداڵ لە سۆز و خۆشەویستی لەلایەن دایکان و باوکانەوە زیانێکی زۆر بە منداڵ دەگەیەنێت، بەتایبەتی لەڕووی سۆزداری و دەروونی و هزری و زانستی و کۆمەڵایەتییەوە، کە دەتوانین لە چەند خاڵێکدا چڕکەینەوە:

- هەست بەخۆبەکەمزانین دەکات.
- بڕوا و متمانەی بەخۆی نامێنێت.
- کەسێکی دڵڕەق و نامیهرەبان دەبێت.
- کەسێکی شەرمن و گۆشەگیر دەبێت.
- نابێتە کەسێکی کۆمەڵایەتی.
- گۆشەگیر و دوورەپەرێز دەبێت.
- پەیوەندییەکی سست و لاوازی دەبێت لەگەڵ دایك و باوك و کەسوکارەکانی.
- لە ڕووی دەروونی و سۆزدارییەوە گەشە ناکات.

- لە ژیانی هاوسەرگیریدا سەرکەوتوو نابێت.
- خۆی بە بەشخوراو دەزانێ.
- ڕووبەڕووی کێشەی خێزانی و کۆمەڵایەتی دەبێتەوە.
- هەست بە خەمۆکی دەکات.
- دووچاری خەوزڕان دەبێ.
- حەزی بۆ خواردن نابێت.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

پێویستە دایک و باوک لەو ڕاستییە حاشاهەڵنەگرە تێبگەن کەوا بەخشینەوەی سۆز و خۆشەویستی بە منداڵەکانیان، لە ئەرکە هەرە گرنگەکانیانە، چونکە سۆز و خۆشەویستی دایک و باوک بۆ منداڵ دەبێتە هەوێنی مرۆڤدۆستی و ژیاندۆستی و بەزەیی و دوورکەوتنەوە لە توندوتیژی و شەڕەنگێزی و تووڕەیی و هەستکردن بە دڵئاسوودەیی و کامەرانی.

بۆیە پێویستە تا ئەوپەڕی توانا، سۆز و خۆشەویستی خۆیان بە منداڵەکانیان ببەخشن، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بهاوێژن:

- بەنەرم و نیانی ڕەفتار لەگەڵ منداڵەکانیان بکەن.
- خۆشەویستی خۆیان بۆ منداڵەکانیان دەربڕن.
- دوورکەوتنەوە لە هەموو جۆرە توندوتیژییەک.
- منداڵەکانیان لە ئامێز بگرن و ماچ بکەن.

- دیاری و خەڵاتیان پێ ببەخشن، بەتایبەتی لەسەر کارە چاکەکانیان و بۆنە جیاجیاکان.
- یاری و گاڵتەیان لەگەڵدا بکەن.
- پێکەوە لەگەڵ منداڵەکانیان بچن بۆ پارك و شوێنە خۆش و گەشت و گوزارییەکان.
- پێکەوە لەگەڵ منداڵەکانیان بۆ هەندێ شوێن سەفەر بکەن.
- بە شێوەیەکی پراکتیکی فێرە چەمکی میهرەبانی و مرۆڤدۆستی و ژیانپەروەری و دلۆڤانی و لێبوردەیی و دان و ستاندن بکەن.
- بە شێوەیەکی مرۆڤدۆستانە سەرەدەری لەگەڵ منداڵەکانیان بکەن.
- جیاکاری لە نێوان منداڵەکانیان نەکەن.
- رێز لە منداڵەکانیان و تایبەتمەندییەکانیان بگرن.

## کوشتنی بەهرە و تواناکی منداڵ

هیچ کەسێك، بە منداڵیشەوە نییە کە خاوەن بەهرە و توانای تایبەت بەخۆی نەبێت، جا ئەگەر توانرا گەشە بەو بەهرە و توانایانە بدرێت، ئەوا سوودێکی زۆر بۆ خودی ئەو کەسە و کۆمەڵگە دەبێت، بەڵام ئەگەر ئەو بەهرە و توانایانە پشگوێخران و نادیدە گیران، ئەوا هەموو خودی کەسەکە، هەمیش کۆمەڵگە زەرەرمەند دەبێت و ناتوانێ بۆ پێشکەوتن و سەرکەوتن و تێگەیشتن و پێگەیشتنی خۆی، سوود لەو بەهرە و توانایانە وەربگرێ .

ئەڵبەتە هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە زۆرێك لە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن بریتییە لە کوشتنی بەهرە و تواناکی منداڵەکانیان، ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- ناوشیاری و بێئاگایی دایك و باوك بەرامبەر منداڵ.
- نزمی ئاستی زانستی دایك و باوك.
- هەست نەکردن بەبەرپرسیارەتی.
- بەهەڵە سەرەدەریکردن لەگەڵ منداڵ.
- فەرامۆشکردن و پشتگوێخستنی منداڵ.
- لەبەرچاونەگرتنی بەهرە و تواناکانی منداڵ.
- گەشەنەدان بە توانا و بەرهەکانی منداڵ.
- تێرنەکردنی حەزە سەرەکییەکانی منداڵ.
- ئاشنا نەبوون بە قۆناغەکانی گەشەکردنی منداڵ.
- خۆدزینەوە لە ئەرك و بەرپرسیارەتی.

هەموو ئەم هۆکارانە و هۆکارەکانی دیکەش، وا دەکات کە منداڵ نەتوانێ لەسەر پێیەکانی خۆی بوەستێت و لە ژیانی خۆیدا سەرکەوتوو بێت و نەتوانێ پەرە بە بەهرە و تواناکانی خۆی بدات و ڕۆڵی شایستەی خۆی لەناو کۆمەڵگەدا ببینێت.

ئەڵبەتە زانایانی بواری پەروەردە و فێرکردن پێیان وایە هەموو منداڵێك هەڵگری کۆمەڵێك بەهرە و توانای شارایەوە، بەڵام ئەوە دایك و باوك و ژینگەی خێزان و قوتابخانە و کۆمەڵگەیە کە وادەکات ئەو بەهرە و توانایانە گەشە بکەن یان بمرن!

بێگومان ئەگەر پەرە بە بەهرە و تواناکانی منداڵ نەدرێت،زیانێکی زۆر بەخودی منداڵ و خێزان و کۆمەڵگە دەگەیەنێت، کە لە چەند خاڵێکدا دەخەمە ڕوو:

- بەهرە و توانا ماتەوەزەکانی منداڵ نادۆزرێنەوە وگەشەیان پێنادرێت، هەندێ جاریش دەگاتە ئاستی کوشتنی ئەو بەهرە و توانایانە.
- منداڵ لە بەهرە و توانا ڕاستەقینەکانی خۆی بێبەش دەبێت.
- منداڵ لە ئەرك و کارەکانیدا سەرکەوتوو نابێت.
- منداڵ ناتوانێ وەك پێویست پێشڤە بچێت و حەز و ئارەزووەکانی بێنێتە دی.
- منداڵ لە هاوڕێ بەهرەمەند و تواناکارەکانی خۆی جێدەمێنێ.
- منداڵ لە خوێندن سەرکەوتوو نابێت.
- بە لەدەستدانی توانا و بەهرەکانی منداڵ، خێزان و کۆمەڵگە زەرەرمەند دەبن.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

پێویستە دایك و باوك ئەو ڕاستییە بزانن کەوا منداڵ وەك پەڕەیەکی سپی وایە، بۆیە هەر شتێکیان گەرەك بێت، دەتوانن تێدا تۆماری بکەن، جا پێویستە ئەو دەرفەتە زێڕینە بقۆزنەوە و بەجددی هەوڵدەن پەی بە توانا و بەهرەکانی منداڵەکانیان ببەن و هەموو هۆکارێکی ماددی و مەعنەوەی بگرنە بەر بۆ گەشەدان بەو بەهرەو توانایانە، تاکو لەسەر قاچەکانیان بوەستن و بتوانن هەمبەر

ئاستەنگەکانی ژیان خۆڕاگر بن و بەوپەڕی تواناوە بەرەو ئایندەیەکی گەش هەنگاو بنێنن، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە ئەم هەنگاوانە بهاوێژن:

- بەخشینی خۆشەویستی بە منداڵ.
- پەروەردەکردنی منداڵ بەشێوەیەکی زانستییانە.
- پەی بردن بە توانا و بەهرەکانی منداڵ و دۆزینەوەی ئەو بەهرە و توانایانە.
- سەرەدەریکردن لەگەڵ منداڵ بەشێوەیەکی زانستییانە و بابەتییانە.
- بەردەستکردنی گشت توانا ماددی و مەعنەوییەکان بۆ منداڵ.
- دوورخستنەوەی منداڵ لە دۆست و هاوڕێی خراپ و لاسار.
- پاراستنی مافەکانی منداڵ.
- هەستکردن بە بەرپرسیارەتی.
- خۆدوورخستنەوە لە هەموو جۆرە توندوتیژییەك دژبەری منداڵ.
- یارمەتیدانی منداڵ بۆ گەشەدان بە توانا و بەهرەکانی.
- سوودوەرگرتن لە شارەزایی زانا و پسپۆڕانی پەروەردەیی.
- خۆپاراستن لەسەرکۆنەکردنی منداڵ.

## درۆکردن لەگەڵ منداڵ

درۆ، دەردێکی کوشندەیە، هەر کەسێك و کۆمەڵگەیەك بە درۆ گرفتار ببێت، دادەڕزێ و بۆگەن دەبێت، چونکە دەبێتە هۆی کوشتنی متمانە و ڕاستگۆیی و پردی متمانەی نێوان تاکەکان دەڕووخێنێ.

بۆیە ئەگەر درۆ بۆ خەڵك جارێك ناشیرین بێت، بۆ دایك و باوك دووجار ناشیرینە، جارێك لەبەر خودی درۆیەکە، کە دزێو و قێزەونە و پەڵەیەکی ڕەشە، جارێکیش لەبەر ئەوەی کە درۆ لەگەڵ منداڵەکانیان دەکەن و فێریان دەکەن تاکو درۆ بکەن، یاخود ڕێخۆشکەرن بۆ منداڵەکانیان، تاکو لاسایی ئەوان بکەنەوە و ڕێچکەی ئەوان بگرن!

بەڵام زۆربەی جار درۆ، پەیوەندی نێوان دایك و باوك منداڵ لاواز دەکات و بەرەو هەڵدێر دەبات، چونکە ئەو متمانەیەی کە پێویستە هەمیشە لە نێوانیاندا هەبێت، پەیتا پەیتا لاواز دەبێ و نامێنێ.

مخابن! یەکێك لەو هەڵە باوانەی کە دایك و باوك دەرهەق بەمنداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە درۆکردن لەگەڵ منداڵەکانیان، جا درۆکردنەکە بە جددی بێت یان شوخی، ڕەش بێت یان سپی، بچووك بێت یان گەورە، کەم بێت یان زۆر، ڕاستەوخۆ بێت یان ناڕاستەوخۆ و بە مەبەست بێت یان بێ مەبەست و...تاد.

بەهەرحاڵ درۆ هەر درۆیە و جگە لە بێ متمانەیی و خۆناشیرینکردن و ڕاکردن لە ڕاستی و هەقیەت، هیچی دیکەی لێ سەوز نابێت.

بێگومان زۆرجار منداڵ لاسایی دایك و باوکی دەکاتەوە و لێیانەوە فێرە درۆکردن دەبێت و وادەکات درۆ لای ئەو ببێتە شتێکی ئاسایی و لە ژیانی خۆیدا پەنای بۆ بەرێت.

ئەڵبەتە درۆکردنی دایك و باوك بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- هۆکاری بۆماوەیی و هەبوونی کەسانی درۆکەر لە ناو خێزانی دایك و باوکەکەدا.
- هەبوونی گرێی دەروونی.
- هەبوونی کێشەی خێزانی و کۆمەڵایەتی.
- پەروەردەنەبوونیان لەناو ژینگەیەکی تەندروستدا.
- هەبوونی کەسانی درۆزن لەناو ئەو ژینگەیەی کە تێدا گەورەبوون.
- درۆکردن بەمەبەستی شاردنەوەی شکست و کەم و کوڕییەکانیان.
- درۆکردن بۆ خۆدزینەوەیە لە جێبەجێکردنی ئەرکی سەرشانیان.
- بۆ خۆدەرخستن و خۆپەسنین و پاڵەوانبازی.
- بۆ ڕازیکردنی منداڵ.
- بۆ چەواشە و بەلاڕێدابردنی منداڵ.
- هەست نەکردن بە بەرپرسیارەتی.
- پابەندنەبوون بە بنەما ڕەوشتی و ئایینییەکان.
- هەبوونی هەستی خۆبەکەمزانین.
- چاولێکەری و لاساییکردنەوە.
- بۆ خۆدەربازکردن لە سکاڵا و گلەیی و سزا.
- ڕاهاتن و خووگرتن لەسەر درۆکردن.

**زیانەکانی درۆکردنی دایك و باوك لەگەڵ منداڵ:** درۆکردنی دایك و باوك، زیانێکی زۆر بە خۆیان و منداڵ و کۆمەڵگەش دەگەیەنێت، کە لە خوارەوە ئەو زیانانە دەخەینە ڕوو:

- دایك و باوك بەهۆی درۆکردنەوە، ئەو متمانەیە لەدەست دەدەن، کە لە نێوان خۆیان و منداڵەکانیان هەیە.
- درۆ، پەتایەکی کوشندەیە، ئەگەر چارەی بۆ نەدۆزرێتەوە، وەك تۆپەڵەی بەفر وایە، ڕۆژ بە ڕۆژ گەورە دەبێت و تەشەنە دەکات.
- دایك و باوك بەهۆی درۆکردنەوە، دەبنە هۆکارێك بۆ ئەوەی منداڵەکانیان چاو لەوان بکەن وفێرە درۆکردن ببن و ببن بە درۆزن.
- منداڵ دووچاری بەدگومانی و دڵپیسی دەبێت سەبارەت بە دایك و باوکی و کۆمەڵگە بەگشتی.
- منداڵ فێرە درۆ دەبێت و پەنا بۆ درۆکردن دەبات.
- منداڵ لە ڕێگەی درۆکردنەوە، پەنا بۆ فرت و فێڵ و چەواشەکاری دەبات.
- منداڵ لە بەها ڕەوشتییەکانی وەك ڕاستگۆیی دوور دەکەوێتەوە.
- کۆمەڵگە بە درۆی تاکەکان دووچاری کێشە و قەیران دەبێتە، لەوانە کێشەی نەبوونی متمانە لە نێوان تاکەکان و دوورکەوتنەوە لە بەها بەرزە ئایینی و کۆمەلایەتییەکانی وەك: ڕاستگۆیی و ئەمانەتداری و دڵسۆزی وهیتر.

**چارسەرکردنی ئەم هەڵەیە:**

دایک و باوک دەبێ ئەو هەقیقەتە بزانن کەوا منداڵ سپاردە و ئەمانەتێکە لەبەردەستیان، بۆیە دەبێ تاسەر ئێسقان ئەو سپاردە و ئەمانەتە بپارێزن و لە ڕەفتار و کردار و گوفتاریاندا توخنی درۆکردن نەکەون، بۆ ئەوەی بتوانن ببنە پێشەنگ بۆ منداڵەکانیان، تاکو چاویان لێ بکەن و فێرە ڕاستی و ڕاستگۆیی بنن.

بۆ هێنانەدی ئەم مەبەستەش پێویستە دایک و باوک ئەم هەنگاوانە بهاوێژن:

- لە کردار و ڕەفتار و گوفتارەکانیاندا ڕاستگۆ بن.
- هیچ کاتێ درۆ لەگەڵ منداڵەکانیان نەکەن.
- درۆ لە پێش چاویان ناشیرین بکەن و ڕاستی لەپیش چاویان شیرین بکەن.
- هانی منداڵەکانیان بدەن بۆ ڕاستگۆیی و لەسەر ئەمە پاداشتیان بکەن.
- ژینگەیەکی وا بۆ منداڵەکانیان بڕەخسێنن کەوا درۆ نەکەن.
- بە شێوازێکی زانستی و پەروەردەیی سەرەدەری لەگەڵ منداڵەکانیان بکەن.
- دەبێ زیانەکانی درۆکردن بۆ منداڵەکانیان ڕوونبکەنەوە.
- سوودەکانی ڕاستی و ڕاستگۆیی بۆ منداڵەکانیان بخەنە ڕوو.
- ئەگەر سۆز و پەیمانێکیان دا، سۆز و پەیمانەکەیان ببەنەسەر.
- هیچ کاتێ ڕاستیی بە درۆ نەگۆڕنەوە، تەنانەت ئەگەر باجەکەشی قورس بێت.

## نازاندن و زیاد له حەد خۆشویستنی منداڵ

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە کوشندانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان، دەرهەق بە منداڵەکانیان دەیکەن، بریتییە لە نازاندن و زیاد لە حەز خۆشویستنی منداڵ، مخابن! هەندێ دایک و باوک لە بەخێوکردنی منداڵەکانیان زیادەڕوویی دەکەن، واتە ناز دەدەنە منداڵ و بەناز پەروەردەی دەکەن و هەرچی بخوازێ و دەستی بۆ ببات، بەبێ سێ و دوو بۆی جێبەجێ دەکەن.

ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- هۆکاری تاقانەبوونی منداڵ.
- لێکجیانەکردنەوەی پێداویستییە سەرەکییەکانی منداڵ و ئارەزووەکانی.
- نزمی ئاستی زانستی دایك و باوك.
- دەوڵەمەندی و هەڵڕشتنی پارە بەسەریدا.
- لێنەپێچینەوە لەسەر هەڵەکانی.
- خۆشەویستییەکی لەڕادەبەدەری دایك و باوك بۆ منداڵ.
- ئاشنا نەبوونی دایك و باوك بە بنەما زانستی و پەروەردەییەکان.
- نەشارەزایی و ناوشیاری دایك و باوك.
- کەم ئەزموونی و ناشارەزایی

**زیانەکانی نازاندن و زیاد لە حەد خۆشویستی منداڵ:** ئەڵبەتە ئەم نازاندنە زیانێکی زۆر بە کەسایەتی و بەهرە و تواناکانی منداڵ دەگەیەنێت، کە لەم چەند خاڵەدا چڕ دەکەینەوە:

- منداڵی نازندی(نازپێدراو)، هەمیشە لەسەر داواکاریەکانی پێداگر دەبێت و عینادی دەکات.
- جیاوازی لە نێوان خواستەکان و ئارەزووەکانی خۆی ناکات.
- داوای شتگەلێکی ناماقول و زیاد لە پێویست لە دایك و باوکی و کەسانی دیکە دەکات.
- ڕێز لە مافی کەسانی دیکە ناگرێ.
- هەوڵدەدات رای خۆی بەسەر ئەوانی دیکەدا بسەپێنێت.
- بەردەوام دەم بە گلەیی دەبێت.
- ناتوانێ هەمبەر کێشە و ئاستەنگەکاندا، ئارام و دانبەخۆداگر بێت.
- وا دەزانێ هەمیشە لەسەر هەقە و هەق تەنیا لای ئەوە.

ئەڵبەتە ئەم نازاندنە بۆ هیچ منداڵێك تاسەر نابێت، بۆیە هەر کاتێ دایك و باوك پشتیان لە منداڵەکە کرد و وەك خۆی نازی نەدایە، ئەوا منداڵەکە لەڕووی دەروونییەوە دووچاری شڵەژان دەبێت و ناتوانێ لە ناو ژینگەی خێزان و قوتابخانە و کۆمەڵگە خۆی بگونجێنێت و دووچاری دڵتەنگی و دڵەڕاوکێ و پەرێشانی دەبێ و ناتوانێ ببێتە کەسێکی پشتبەخۆبەستوو و سەرکەوتوو و بەرپرسیارەتی وەرگر، هەروەها دووچاری ڕەشبینی دەبێت و دەبێتە کەسێکی گۆشەگیر و خەمۆك و لاواز و خۆویست و خۆپەرست و ناتوانێ بە تەنیا بڕیار بدات و هەنگاو بهاوێژێت و بەرگەی ئەو ئاستەنگ و کێشانە بگرێت کە ڕووبەڕووی دەبنەوە.

**چارسەرکردنی ئەم هەڵەیە:**

بۆ ئەوەی منداڵ بەشێوەیەکی هاوسەنگ بێتە پەروەردەکردن و دوور بێت لە ئیفرات و تەفریت، پێویستە دایک و باوک بە شێوەیەکی بابەتییانە و زانستییانە منداڵەکانیان پەروەردە بکەن و خۆیان لە نازاندنیان بەدوور بگرن.

بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەن:

- پێویستە خۆشویستنی منداڵ بە ئەندازەیەک بێت، نە شیش بسووتێت نە کەباب!
- بە ئەندازەی پێویست گرنگی بە منداڵ بدەن، واتە، نە زیادەڕۆیی تێدا بکرێت، نە پشتگوێ بخرێت.
- گشت داواکارییەکانی منداڵ جێبەجێ نەکەن و ویست و ئیرادەی خۆیان ڕادەستی نەکەن.
- وا منداڵ بار نەهێنن، کە داوای هەر شتێکی کرد، بێ سێ و دوو بۆی بەردەست و جێبەجێ بکرێت.
- دەبێ دایک و باوک لێگەڕێن منداڵ پشت بەخۆی ببەستێت و بەخۆی نان بخوات ، یاخود بچێتە دوکان و یاری بکات و بچێتە قوتابخانە، بەڵام ڕێنمایی بکەن و چاودێری کارەکانی بکەن.
- دەبێ دایک و باوک یەک شێوازی پەروەردەیی لەگەڵ منداڵ پەیڕەو بکەن.
- نابێ ئازادییەکانی منداڵ سنووردار بکەن.
- نابێ منداڵ لە یاری بێبەش بکرێت.
- نابێ زێدە لە پێویست پارەی پێ بدرێت.

- دەبێ دایک و باوک جیاوازی بکەن لە نێوان پێداویستییە سەرەکییەکانی منداڵ و ئارەزووەکانی.
- دەبێ منداڵ وا ڕام بکرێت کە ڕێز لە ماف و ئازادییەکانی کەسانی دیکە بگرێت.
- دەبێ زێدە لە حەد پەسنی منداڵ نەکرێت.
- دەبێ منداڵ فێرە ئارامگرتن و دانبەخۆداگرتن بکرێ.
- دەبێ منداڵ بزانێ کە مافی هەیە و ئەرکیشی لەسەرە.

## نادادپەروەریكردن لە نێوان منداڵەكان

هەڵەیەكی دیكە لەو هەڵانەی كە هەندێ لە دایكان و باوكان دەرهەق بە منداڵەكانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە نادادپەروەریكردن لە نێوان منداڵەكانیان، واتە بە یەك چاو سەیری هەمووان ناكەن و وەك یەك سۆز و خۆشەویستی خۆیان بەسەریان دا نابەخشنەوە و وەك یەك پێداویستییە جەستەیەكانیان بۆ دابین ناكەن، ئەمەش بۆ چەند هۆكارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- هەست نەكردن بە بەرپرسیارەتی.
- بەكارهێنانی دڵڕەقی و توندوتیژی.
- بەهرەمەندنەبوون لە بها پەروەردەیەكان.
- پەنگخواردنەوەی هەستی تۆڵەسەندنەوە لە ناخیاندا.
- دووركەوتنەوە لە بەها ئایینی و ڕەوشتییەكان.
- لاوازی ئاستی زانستی دایك و باوك.
- زاڵبوونی هەستیان بەسەر عەقڵیاندا.
- بیرنەكردنەوە لە ئاینده وگەورەبوون لە ژینگەیەكی خێزانی و كۆمەڵایەتی ناتەندروست و...تاد.
- كاریگەری نەریتیی كولتووری و داب و نەریتە باوەكانی كۆمەڵگە لەسەر دایك و باوك

بێگومان نادادپەروەریكردن لە نێوان منداڵەكان، زیانێكی زۆری هەیە ۆ خودی دایك و باوك و منداڵ و كۆمەڵگەش بەگشتی، چونكە ئەم ادادپەروەرییە دەبێتە سەرچاوەی كێشە و ناكۆكی و دووبەرەكی و ێكدووركەوتنەوە و لێكترازان، هەروەها چاندنی تۆوی ڕق و كینە لەناو

ناخی منداڵاندا، بەتایبەتی ئەو منداڵانەی کە هەست بە نادادپەروەری دەکەن و پێیان وایە ستەم و غەدریان لێدەکرێ و بە پلە دوو و سێ هەژمار دەکرێن.

ئەڵبەتە ئەو منداڵانەی کە نادادپەروەرییان بەرامبەر دەکرێت دووچاری ئەم کێشانە دەبن:

- هەست بە غەدر و ستەم دەکەن.
- وا هەست دەکەن لە ماڵەوە پلە دوو و سێ نە و فەرامۆش کراون.
- بیر لە تۆڵەسەندنەوە دەکەنەوە لە خوشك و برا و دایك و باوکەکانیان و بەچاوی دوژمن لێ دەڕوانن.
- بوغز و ڕق و کینە لە ناخیان دا پەنگدەخواتەوە و ڕەگ دادەکوتێ.
- هەست بە خەمباری و خەفتباری دەکەن و دووچاری پەریشانی و خەمۆکی دەبن.
- دووریەرێز و گۆشەگیر دەبن.
- لە ژیانیان دا سەرکەوتوو نابن.
- لە سۆز و خۆشەویستی بەهرەمەند نابن.
- کەسانی خۆشبین و گەشبین نابن.
- دڵ و دەروونیان ئارام نابێ.
- بەچاوی گومانەوە سەیری کەسانی دیکە دەکەن.
- بەشێوەیەکی نەرێنی بیردەکەنەوە.

**چارسەرکردنی ئەم هەڵەیە:**

بۆ ئەوەی منداڵان و خێزان و کۆمەڵگەش ڕووبەڕووی کێشە و ئاستەنگ نەبنەوە و بەشێوەیەکی هاوسەنگ و ئاسایی گەشە بکەن، پێویستە دایك و باوکەکان، تا ئەو پەڕی توانا، دادپەروەر بن و خۆیان لە نادادپەروەریکردن بپارێزن، بەتایبەتی لەگەڵ منداڵەکانیان، بۆ هێنانەدی ئەم مەبەستەش، گەرەکە ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بهاوێژن:

- لە ڕەفتار و کردار و گوفتاریاندا بە شێوەیەکی دادپەروەرانە سەرەدەری لەگەڵ منداڵەکانیان بکەن.
- بە شێوەیەکی هاوسەنگ و یەکسان پێداویستییە ڕۆحی و دەروونی و جەستەیەکانیان دابین بکەن.
- خۆیان بە دووربگرن لە پلەبەندیکردن، واتە دیاریکردنی منداڵی پلە یەك و دوو و سێ.
- خۆیان لە هەر کارێك بەدوور بگرن، کە بۆنی نادادپەروەری لێبێت.
- خۆیان لە هەر کارێك بەدوور بگرن کە منداڵەکانیان هەست بەوە بکە کە فەرامۆش کراون و پشتگوێ خراون.
- پێویستە دایك و باوك بە یەك شێوازی پەروەردەیی سەرەدەری لەگەڵ منداڵەکانیان بکەن، بەڵام جیاتاکی نێوانیان لەبەرچاو بگرن.

## پەیمان و بەڵێن شکاندن

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە زۆرێك لە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە بەڵێن و پەیمان شکاندن.

ئەمەش بۆ چەند فاکتەرێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- درۆزنی دایك و باوك و ڕاهاتن لەسەر ناڕاستی و درۆکردن.
- فێڵبازی و تەلەکەبازی و دەستخەڕۆکردن و لەخشتەبردنی منداڵ.
- پابەندنەبوون بە بنەما ڕەوشتی و ئایینییەکان.
- بەهرەمەندنەبوون لە پەروەردەیەکی تەندروست.
- لەپێناو خۆدەربازکردن لە هەندێ کۆت و بەندی خێزانی.
- بۆ نەچارکردنی منداڵ تا کارێك ئەنجام بدات.
- گفت و بەڵێن وەك هۆکارێك بەکاردێنن، بۆ کەمکردنەوەی ئەو فشارانەی کە لەلایەن منداڵەکانیانەوە دەخرێتە سەریان و...تاد.

ئەڵبەتە بەڵێن و پەیمان شکاندن هەر تەنیا زیانی بۆ منداڵ نییە، بگرە دایك و باوك و خێزان و کۆمەڵگەش لێی زەرەرمەند دەبن، بەڵام بەپلەی یەکەم منداڵ زەرەرمەند دەبێت و دووچاری ئەم کێشانە دەبێت:

- منداڵ بڕوا و متمانەی بە دایك و باوکی نامێنێ.
- پەیمان شکێنی دەکات.
- فێرە درۆ دەبێ.
- فێڵ لە خەڵکی و دایك و باوکی دەکات.
- دەبێتە کەسێکی نابەرپرس و هەست بە بەرپرسیارەتی ناکات.

- لە بەها ڕەوشتی و پەروەردەیی و ئایینییەکان دووردەکەوێتەوە.
- ڕێز لە کات ناگرێت.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی دایك و باوك لە چاوی منداڵەکانیان دا گەورە بن و بڕوا و متمانەی خۆیان لە دەست نەدەن و جێی متمانەی منداڵەکانیان بن، دەبێ ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەن:

- هەر کاتێ گفت و بەڵێنیان بە منداڵەکانیان دا، گفت و بەڵێنەکانیان ببەنەسەر.
  - دەبێ کاتێ گفت و بەڵێن بدەن، کە دڵنیا بن دەتوانن ببەنەسەر.
  - خۆیان لە گفت و بەڵێنێ ناواقعی و نازانستی بپارێزن.
- ئەگەر جارێ لە جاران نەیانتوانی گفت و بەڵێنەکانیان ببەنەسەر، هۆکارەکەی بۆ منداڵەکانیان ڕوونبکەنەوە و لە ئایندەدا بۆیان قەرەبوو بکەنەوە، تاکو پردی متمانە لە نێوانیاندا نەڕووخێت.
- گفت و بەڵێنەکانیان لە قەناعەتەوە سەرچاوی گرتبێت و بۆ دەستخەڕۆکردن و لەخشتەبردن و فێڵ کردن نەبێت لە منداڵەکانیان.

## ترساندنی منداڵ

ترس و تۆقاندن، خۆی لە خۆیدا پەتایەکی بڤە و مەترسیدارە، بەتایبەتی بۆ منداڵ، چونکە بەهرە و تواناکی مرۆڤ لەناو دەبات و وا دەکات کە نەتوانێ پشت بە تواناکانی خۆی ببەستێ و لەسەر قاچەکانی خۆی بوەستێ.

بۆیە هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە ترساندن و تۆقاندنی مندال، ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- هەست نەکردن بە بەرپرسیارەتی.
- دەمکۆتکردن و بێدەنگکردنی منداڵ.
- سنووردانان بۆ خواست و داواکارییەکانی منداڵ.
- لاوازی ئاستی زانستی و پەروەردەیی دایك و باوك.
- پەنگخواردنەوەی بوغز و قین لە ناخیاندا و خاڵیکردنی ئەو بوغز و قینە.
- لەپێناو خۆدەرخستن و نیشاندانی باسك و ماسولکەکانیان.
- کولتوور و داب و نەریتی کۆمەڵگە.
- چاولێکەری و لاساییکردنەوەی کەسانی دیکە.
- هەبوونی فشاری دەرەکی لەسەر دایك و باوك.

بێگومان پەنابردن بۆ چەکی ترس، کارێکی زۆر بڤە و مەترسیدارە، چونکە ئەم زیانانەی بۆ منداڵ بەتایبەتی و، کۆمەڵگەش بەگشتی دەبێ:

- منداڵ بڕوا و متمانەی بەخۆی نامێنێ و ناتوانێ پشت بە خۆی ببەستێ و لەسەر قاچەکانی بوەستێ.
- لە ژیانی خۆیدا کەسێکی ترسنۆك دەبێت.
- ناتوانێ بەرگری لە مافە ڕەواکانی خۆی بکات.
- کەسایەتییەکی لاوازی دەبێ و ناتوانێ بەرگەی نەخۆشی و ناخۆشییەکانی ژیان بگرێ.
- خەڵك ناتوانێ پشتی پێ ببەستێت.
- لە کارەکانیدا ڕاڕا و دڕدۆنگ دەبێ.
- لە ژیانی خۆیدا سەرکەوتوو نابێ و دووچاری نسکۆ دەبێ.
- توانای بڕیاردانی نابێ، بەتایبەتی لە بابەتە چارەنووسسازەکاندا.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی منداڵ لە داوی دێوەزمەی ترس ڕزگاری بێت و لە ژیانی خۆیدا کەسێکی دلێر و بوێر و چاونەترس بێت، دەبێت دایك و باوکی ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بهاوێژن:

- نابێ منداڵەکانیان بترسێنن، بەتایبەتی لە تەمەنی زوودا، چونکە ترساندنی منداڵ بە جنۆکە یان دێو، یاخود شتە ترسێنەرەکان، وا دەکات، کەوا منداڵ ببێتە کەسێکی ورەبەزیو و تۆقیو و ترسنۆك و پشت بەخۆ نەبەستوو.
- دەبێ دایك و باوك ترسەکانی منداڵ بڕەوێننەوە و لە ترس و دڵەڕاوکێ ڕزگاری بکەن.

- نابێ منداڵ ببەن بۆ شوێنێك، كە بۆ منداڵ سەرچاوەی ترس بێت، تاكو بۆی ڕوونەكرێتەوە و ترسەكەی نەڕەوێتەوە.
- نابێ بەنازپەروەردەكردنی منداڵ بگاتە ئاستێك، كە منداڵ بەبێ دایك و باوكی نەتوانێ لە ماڵەوە دەرچێت یان لە ماڵەوە بمێنێتەوە.
- نابێ بۆ ژیركردنەوەی منداڵ، پەنا بۆ ئامێر و ئامراز و ئاژەڵە ترسناكەكان ببەن، یاخود باسی ئەو شتانە بكرێت كە سەرچاوەی ترس و تۆقاندنن بۆ منداڵ، تاكو ترس لە ناخ و دەروونیدا چەكەرە نەكات.

## تێکشکاندنی کەسایەتی منداڵ

کەسایەتی، شوناس و ناسنامەی مرۆڤە، بۆیە هەبوونی کەسایەتییەکی بەهێز، بۆ مرۆڤ بەگشتی و منداڵ بە تایبەتی زۆر گرنگ و بایەخدارە، بۆ ئەوەی بتوانێ هاوسەنگی و تایبەتمەندی خۆی بپارێزی و لە گشت کایەکانی ژیاندا پێشکەوتوو و سەرکەوتوو و پشتبەخۆ بەستوو و لێهاتوو بێت.

بێگومان هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە تێکشکاندنی کەسایەتی منداڵ، واتە کەسایەتی منداڵ لەناو دەستی دایك و باوکیدا، وەك بۆکە شووشە وایە، بەکەیفی خۆیان گاڵتەی پێ دەکەن و ورد و خاشی دەکەن و تێکی دەشکێنن، ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- هەست نەکردن بە بەرپرسیارەتی.
- بێباکی و خەمساردی.
- دوورکەوتنەوە لە بەها پەروەردەیی و ڕەوشتی و ئایینییەکان.
- نزمی ئاستی زانستی دایك و باوك.
- خۆدزینەوە لە ئەرك و بەرپرسیارەتی خێزانی.
- خۆدەرخستن.
- شاردنەوە و پەردەپۆشکردنی کەمو کوڕییەکانیان.
- لەپێناو خاڵیکردنی ڕق و کینە پەنگخواردووەکانیان.
- لاوازی کەسایەتی دایك و باوك.
- بەمەبەستی تۆڵەکردنەوە و سزادان.

هەموو ئەم هۆکارانەش وا دەکات کەوا کەسایەتی منداڵ بێتە تێکشکاندن و هەست بە بوون و شوناسی خۆی نەکات و ڕووبەڕووی ئەم زیانە زۆرانە ببێتەوە:

- پەیدابوونی هەستی خۆبەکەمزانین لای منداڵ.
- لاوازی کەسایەتی.
- ورە ڕووخاوی.
- شکسخواردن لە کارەکانیدا.
- بڕوا و متمانە بەخۆ نەبوون.
- شەرمنی و گۆشەگیری و دوورەپەرێزی.
- پشت بە خۆ نەبەستن.
- کوشتنی توانا و بەهرەکانی.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی منداڵ لە ژیاندا خاوەن کەسایەتی خۆی بێت و بتوانێ پشت بە خۆی ببەستێت، دەبێ دایك و باوك ئەم هەنگاوە گرنگانەی خوارەوە بهاوێژن:

- پێویستە وەك مرۆڤێك، ڕێز لە تایبەتمەندی و کەسایەتی و مافەکانی منداڵ بگیرێت.
- لۆمە و سەرزەنشتی منداڵ نەکەن، بەتایبەتی لە حزوری کەسانی دیکەدا.
- کار لەسەر ڕاستکردنەوەی هەڵەکانی منداڵ بکەن، نەك لەسەر تێکشکاندنی کەسایەتی ئەو.

- دەبێ بزانن کە هەموو منداڵێك هەڵە دەکات، بۆیە دەبێ کار بۆ کەمکردنەوەی هەڵەکانی منداڵ بکرێ، نەك تێکشکاندنی کەسایەتی منداڵ.
- دەبێ دایك و باوك لێبوردە بن و جگەرگۆشەکانیان لەسەر هەڵە ورد و درشتەکانیان سزا نەدەن، لەگەڵ ئەوەشدا، دەبێ هەڵەکانیان دەستنیشان بکرێن و بۆیان ڕاستبکرێنەوە، بۆ ئەوەی لە ئاییندەدا دووبارە و چەندبارەی نەکەنەوە.
- ڕۆڵیان هەبێت لە دارشتنی بناغەیەکی پتەو بۆ کەسایەتی منداڵ، تاکو لە ئاییندەدا بتوانێ ببێتە کەسێکی زانا و دانا و بەتوانا و پشتبەخۆبەستوو و پێشکەوتوو و لێهاتوو و سەرکەوتوو.
- تەریقنەکردنەوەی منداڵ لەسەر هەڵەکانی، بەتایبەتی لە پێش چاوی هاوڕێیانی و خەڵکانی دیکە.

## پشتگوێخستن و فەرامۆشکردنی منداڵ

مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە، بۆیە دەبێ لە ناو کۆمەڵ بژیت و لەگەڵ تاکەکانیدا کارلێك بکات، نەك بەتەنیا و لە گۆشە تاریکەکاندا ژیان بەسەر ببات.

ئەڵبەتە هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە پشتگوێخستن و فەرامۆشکردنی منداڵ، ئەم فەرامۆشکردنەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- هەبوونی کێشە و ناکۆکی توند لە نێوان دایك و باوك.
- خستنەوەی وەچەیەکی زۆر(فرە منداڵی).
- فرەکاری و پڕئیشی.
- هەست نەکردن بەبەرپرسیارەتی.
- نزمی ئاستی زانستی دایك و باوك.
- پێشێلکردنی مافەکانی منداڵ.
- لەبەرچاونەگرتنی خواستەکانی منداڵ.
- خەمساردی و بێباکی.
- ئاشنا نەبوونی دایك و باوك بە شێوازە پەروەردەییەکان و...تاد.

بێگومان پشتگوێخستن و فەرامۆشکردنی منداڵ، لەلایەن دایك و باوکییەوە، هەڵەیەکی کوشندەیە، چونکە ئەم زیانانەی خوارەوە بەدوای خۆی دا دێنێت:

- منداڵ بەرەڵا و لاسار دەبێت.
- هەست بە بەرپرسیارەتی ناکات و خەمسارد و کەمتەرخەم دەبێت.

- گوێڕایەڵی دایك و باوكی ناكات.
- پابەند نابێ بە گفتەكانییەوە.
- بەدگومانی و بێ متمانەیی لای دروست دەبێت.
- بڕوا و متمانەی بەخۆی نابێت.
- ناتوانێ پشت بەخۆی ببەستێت.
- لە كارەكانیدا سەركەوتوو نابێت.

## چارسەركردنی ئەم هەڵەیە:

بۆ ئەوەی منداڵ بەرەڵا نەبێت و هەمیشە كەسێكی گوێڕایەڵ و فەرمانبەردار بێت و بتوانێ پشت بەخۆی ببەستێت، دەبێ دایك و باوك ئەم هەنگاوە گرنگانەی خوارەوە بهاوێژن:

- دەبێ خەمخۆر و دڵسۆز و دۆستی منداڵەكانیان بن.
- پەروەردەكردنی منداڵەكانیان بەهەند وەربگرن.
- كەلێن و بۆشاییەكی وا دروست نەكەن، كەوا منداڵ لەدەستیان دەربچێ و بەرەڵا ببێت.
- سۆز و میهرەبانی خۆیان پێ ببەخشن.
- ڕێگە نەدەن ببێتە هاوڕێی كەسانی لاسار و خراپ.
- ڕۆژانە چاودێری و بەدواداچوونیان هەبێت بۆ كار و هەڵسوكەوتەكانی منداڵ.
- خۆیان بە بەرپرس بزانن دەرهەق بە منداڵەكانیان.
- پارە كۆكردنەوە و گەشت و گوزار لەسەر حسابی بەخێوكردنی منداڵ نەبێت.

- دەبێ دایک و باوک ئاشنا بن بە شێوازە تازەکانی پەروەردە و فێرکردن.
- خۆپاراستن لە بەکارهێنانی هەموو جۆرە توندوتیژییەک.
- کاری سەخت بەمنداڵ نەکەن، کە بەدەر بێت لە توانا جەستەیەکانی.

## جیاوازیکردن لە نێوان کوڕ و کچ

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن بریتییە لە جیاوازیکردن لە نێوان کوڕ و کچ، ئەم جیاوازیکردنەش بۆ چەند هۆکارێک دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- دەمارگیری بۆ توخم و ڕەگەز.
- نەزانین و بێئاگایی.
- داب و نەریت و کولتووری کۆمەڵگە.
- بیرتەسکی و کورتبینی و نەخوێندنەوەی واقع.
- نزمی ئاستی ڕۆشنبیری و زانستی دایک و باوک.
- لاوازی هەستی مرۆڤدۆستی و ئایینپەروەری .

بێگومان جیاوازیکردن لە نێوان کوڕان و کچان، هۆکارێکە بۆ دروستبوونی ڕق و کین و سەرهەڵدانی کێشەی خێزانی و کۆمەلایەتی و بێبەشبوونی منداڵ لە سۆز و خۆشەویستی دایک و باوک، هەروەها ئەم زیانانەش بۆ کچ بەدوای خۆیدا دێنێت:

- هەستکردن بە غەدر و ستەمکاری.

- بێبەشبوون لە سۆز و خۆشەویستی دایك و باوك.
- بێبەشبوون لە پێداویستییەکانی ژیان، بەتایبەتی خوێندن.
- ڕق ئەستووری بەرامبەر دایك و باوك.
- هەستکردن بە بێ ئومێدی.
- گۆشەگیری و دوورە پەرێزی.
- بڕوابەخۆنەبوون.
- نەبوونی ئازادی
- بڕوابە دایك و باوك نەبوون.
- هەبوونی هەستی تۆڵە سەندنەوە لە دایك و باوك و براکانی.
- سەرکەوتوونەبوون لە ژیاندا.
- هەبوونی هەستی خۆبەکەمزانین.
- بێبەشبوون لە پەیوەندییەکی پەیت و تەندروست لەگەڵ دایك و باوکی و ئەندامانی دیکەی خێزان.
- دەبێتە هۆی ئەوەی کوڕان لەناو خێزان دا هەست بەکەلەگایی بکەن و وا بزانن ماف و ڕاستی هەمیشە لای ئەوانە.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە:

بۆ ئەوەی غەدر و ستەم لە منداڵی مێیەنە، واتە کچ نەکرێ و لە سۆز و میهرەبانی دایك و باوك بەهرەمەند بێت، پێویستە لەسەر دایك و باوك ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەن:

- بەشێوەیەکی دادپەروەرانە سەرەدەری لەگەڵ منداڵەکانیان بکەن و بە یەك چاو سەیری هەموان بکەن.

- به شێوەیەکی یەکسان، خۆشەویستی خۆیان بە کوڕ و کچەکانیان ببەخشن.
- لە کڕین و دابینکردنی پێداویستییەکانیان دادپەروەر بن.
- کارێکی وا نەکەن کە ئەو هەستە لای منداڵی مێینە دروست ببێت کە پلە دووە، یاخود پشتگوێ خراوە و فەرامۆش کراوە.
- ژینگەیەکی وا گونجاو لە ناو خێزان فەرهەم بکەن، کە ببێتە هۆی زیادبوونی سۆز و خۆشەویستی لە نێوان ئەندامانی خێزان بەگشتی و کوڕان و کچان بەتایبەتی.
- خۆیان بەدووربگرن لە هەر جۆرە توندوتیژییەك هەبەر بە منداڵان بەگشتی و کچان بەتایبەتی.
- خۆپاراستن لە درۆ و چەواشەکاری.
- ڕەواندنەوەی بەدگومانی و دڵپیسی.
- پەیڕەویکردنی یەك شێوازی پەروەردەیی لە لایەن دایك و باوکەوە.

## بێبەشکردنی منداڵ لە یاریکردن

یاریی لە ژیانی هەر تاکێکدا بەگشتی و لە ژیانی منداڵ بەتایبەتی بایەخ و گرنگی خۆی هەیە و وێڕای سوودە جەستەیی و هزری و تەندروستی و کۆمەڵایەتییەکان، سوودێکی زۆری ماددیشی هەیە، تەنانەت بۆ زۆرێك لە وڵاتان، ئەمڕۆ یاری و وەرزش سەرچاوەیەکی سەرەکی داهاتە.

بەڵام مخابن هەندێ دایك و باوك ئەم ڕاستییە نازانن، بۆیە بە هەڵە سەرەدەری لەگەڵ ئەم چەمکەدا دەکەن و منداڵەکانیان لە یاری و وەرزش بێبەش دەکەن.

ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- بەتاز پەروەردەکردنی منداڵ و ترسان لەوەی منداڵەکەیان لە کاتی یاری و وەرزشدا، تووشی ڕووداوێك یان کارەساتێك ببێت.
- لاوازی ئاستی زانستی دایك و باوك.
- ئاشنانەبوون بە فەلسەفەی پەروەردە و فێرکردن.
- هەست نەکردن بە بەرپرسیارەتی.
- ترس لە دواکەوتن و دابڕان لە خوێندن.
- هەبوونی بەدگومانی.
- زێدەڕوویی کردن لە پەروەردەکردندا.
- لاساری و سەرەڕوویی منداڵ.
- ئاشنانەبوون بە سوود و قازانجەکانی یاری و وەرزش.
- کارکردن بە منداڵ.

ئەڵبەتە، بێبەشکردنی منداڵ لەگەمە و یاری، ئەم زیانانەی خوارەوە بۆ منداڵەکە بەتایبەتی و کۆمەڵگە بەگشتی بەدواخۆیدا دێنێت:

- دەبێتە هۆی گۆشەگیربوون و دوورەپەرێزبوونی منداڵ.
- رانەهاتن لەسەر چەمکە کۆمەڵایەتییەکان.
- نەگونجیان و یاخیبوون .
- دووچاربوون بەگرێیە سۆزداری و دەروونییەکان.
- تووشبوون بە تەمبەڵی و تەوەزەلی.
- قەلەوبوون و زیادبوونی کێشی لەش.
- تووشبوون بە نەخۆشی و لاوازی و سستی و پەستی.
- سەرنەکەوتن لە بوارە جیاجیاکانی ژیاندا.
- بڕوا بەخۆنەکردن و پشت بەخۆنەبەستن.
- هەست بە نامۆیی و ڤەدەری کردن.
- بێ بەشبوون لە خۆشیی وەرزشی.
- کەمی دۆست و هاوڕێ.
- فراواننەبوونی ئاسۆیی بیرکردنەوەی منداڵ.
- گەشەنەکردنی گیانی داهێنان و نەفراندن لای منداڵ.
- قەرەبوونەبوونەوەی زیانەکانی رابردوو.
- نەبوونی پلە و پایە لە ناو خەڵك و دۆست و هاوڕێ و خزم وکەسانیدا.
- پەی نەبردن بەتوانا شاراوەکانی خۆی.
- هەڵچوون و کاردانەوی نابەجێ(زۆربەی جار).

- هەبوونی شەرمنی و بێدەنگی.
- هەبوونی هەستی خۆ بەکەم دیتن و خۆ بە کەمزانین.
- داڵغەلێدان و ڕووچوون لەناو خەیاڵ و ئەندێشەدا.
- هەبوونی کێشە و نارێشەی جیاجیا لە قۆناغە جیاجیاکانی ژیاندا.

**چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە**

بۆ ئەوەی منداڵ بەشێوەیەکی تەندروست گەشە بکات و دووچاری کێشە و گرفتی کۆمەڵایەتی و دەروونی نەبێتەوە، پێویستە دایکان و باوکان ڕێگەی بۆ خۆش بکەن، بۆ ئەوەی یاری بکات، چونکە لە کاتی یاریکردن دا، منداڵ فێری چەند بەهایەك دەبێت، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

**بەهای جەستەیی:** یاریکردنی چالاکانە و پڕ جموجۆڵ، پێویستە بۆ گەشەکردنی ماسوولکەکانی منداڵ، هەروەها پێویستە بۆ بزواندنی سوڕی خوێن و بەجێهێنانی ئەرکەکانی ئەندامەکانی لەش بە شێوەیەکی ڕاست و دروست.

**بەهای پەروەردەیی و فێرکردن:** یاریکردن بوار لەبەردەم منداڵ خۆش دەکات، تاوەکو لەمیانەی کەل و پەلە جیاجیاکانی یاریکردنەوە فێری زۆر شت ببێت، وەك ئاشنابوونی منداڵ بەشێوە جۆراوجۆرەکان و ڕەنگەکان و قەبارەکان و جلو بەرگ، هەروەها منداڵ لە میانەی یاریکردندا، چەندین زانیاری و کارامەییەك دەستەبەر دەکات، کە ناتوانێ لە سەرچاوەی ترەوە دەستەبەری بکات.

**بەهای کۆمەڵایەتی:** منداڵ لەمیانەی یاریکردندا لەگەڵ کەسانی تر، فێری چۆنیەتی دروستکردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی دەبێت، هەروەها فێر دەبێ کە چۆن بەسەرکەوتوویی هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکات، هەمدیس لە یاریەکەیدا هەڵدەستێ بە چەندین ڕۆڵی کۆمەڵایەتی، کە یارمەتیی دەدات لە تێگەیشتنی سروشتی هەموو ڕۆڵێك لە کۆمەڵگەدا، ئامادەشی دەکات لە ئاییندەدا سەرکەوتوویی لە بەجێهێنانی ئەرکە کۆمەڵایەتییەکەی، هەروەها فێری بەخشین و وەرگرتن و ژیانی هاریکاری و هەرەوەزی دەبێت.

**بەهای ڕەوشتی:** منداڵ لەمیانەی یاریکردندا فێری چەمکەکانی چەوت و ڕاست دەبێت، هەروەها فێری کەمێك لە چەمکەکانی ڕاستگۆیی و دەستپاکی و خۆڕاگری و وازهێنان لە خۆپەرستی دەبێت، لەپێناو یاریکردن لەگەڵ کۆمەڵەکەدا، هەروەها فێری گیانی وەرزشی و لێبوردەیی دەبێت

**بەهای داهێنان:** منداڵ لەمیانەی یاریکردندا توانای زۆری دروستکردن و پێکهێنان و کۆکردنەوە و بەئەزموونکردنی بیرۆکە رووتەکانی بۆ ئاشکرا دەبێت.

**بەهای خودی(الذاتي):** منداڵ لە ڕێی یاریکردنەوە زۆر شت لەبارەی خۆی بۆ ئاشکرا دەبێت، وەك زانینی توانیستەکانی و کارامەیی و لێزانینی و ئارەزووەکانی، ئەمەش لە میانەی هەڵسوکەوتکردنی لەگەڵ ئەوانەی بەشداری یاریکردنەکە دەکەن و خۆی پێیان بەراورد دەکات، هەروەها لەمیانەی گرفتەکانییەوە فێری شت دەبێت و چۆنیش لە گرفتەکان دەربازی دەبێت.

**بەهای چارسەری دەروونی:** یاریکردن رۆلێکی گەورە دەبینێ لە چارسەرکردنی نەخۆشی و قەیرانە دەروونییەکان و، هەندێ جاریش لە سەرهەڵدانیان، چونکە منداڵ لە رێی یاریکردنەوە دەتوانێ شڵەژانی دەروونی لە خۆی لاببات، کە لەو کۆتە جیاجیایانە پەیدابووە، کە بەسەریدا دەسەپێنرێت، لەبەر ئەوە دەبینین ئەو منداڵانەی کە لە ماڵێکدا دەژین کە کۆت و فەرمانکردن و قەدەغەکردنی تێدایە زیاتر لە منداڵانی دیکە یاری دەکەن، هەروەها یاریکردن باشترین هۆکارە بۆ رەواندنەوەی خەمەکانی منداڵ.

هەروەها یاریی چەندین سوودی دیکە بە منداڵ دەگەیەنێت، لەوانە:

- یاریی گەشە بە لایەنی مەعریفی و توانای ئەفراندن و داهێنانەکانی منداڵ دەدات.
- یاریی دەبێتە هۆی هەڵسەنگاندنی ناکاری منداڵ و، کێشەکانی لە میانەی یاریەکانیدا دەدۆزرێنەوە، کە تۆمار دەکرێن و هەڵدەسەنگێندرێن.
- یاریی دەبێتە هۆی ئەوەی ئەندامەکانی دەستی منداڵ رابێن و فێری شارەزایی نوێ ببن، هەروەها دەمار و ماسوولکەکانی منداڵ و هەرزەکاران بەهۆی یاریکردنەوە بەهێز ببن.
- یاریی یارمەتی منداڵ دەدات تاکو لە رووی زمانەوانییەوە گەشە بکات، چونکە لەگەڵ هەڤالانی دەکەوێتە گفتوگۆ و دانوستاندنەوە، بۆیە پەیتا پەیتا هزرەکانی گەشە دەکات.

- یاریی هۆکارێکە بۆ راهێنانی هەر پێنج هەستەکانی (بیستن، بینین، چەشتن، بۆنکردن، بەرکەوتن) و، زانینی نهێنییەکانی گێتی کە لە دەوربەری ڕوودەدەن.
- یاریی دەبێتە هۆی چالاککردن و ئەکتیڤکردنی کاری ئەقڵ.
- یاریی یارمەتی منداڵ دەدات بۆ دروستکردنی هاوسەنگی و پەیوەندییەکی ئەرێنییانە لە نێوان بەزربوونەوەی ژیری و گەشەیەکی باشتری جەستەیی بۆ منداڵ.
- یاریی یارمەتی منداڵ دەدات بۆ راهێنانی لەسەر کۆششە پێویستەکانی جەستەیی و دەروونی بۆ کار کردن.
- ئامادەکردنی منداڵ بۆ کاری جددی.
- یاریی دەبێتە هۆی ئەوەی منداڵ فێری زۆرێك لە بەها ئەخلاقییەکان ببێت، هەروەها یاری یارمەتی منداڵ دەدات، تاکو دەروونی خۆی لەو مەترسییانە بەتاڵ بکاتەوە کە هەیەتی هەمبەر شتەکانی دەوروبەر.
- منداڵ لە رێگەی یاری بەکۆمەڵ و دەستەکۆیی و چاوەڕوانی کردن بۆ نواندنی رۆڵی خۆی، فێری ئارامی و دابەخۆداگرتن و رێزگرتن لە خولیاکانی رەفیقانی دەبێت و لە گۆشەگیری و شکاندنەوە و خۆپەرستی دووردەکەوێتەوە، بۆیە پێویستە هاوسەنگی لە نێوان یارییە تاکەکەسییەکان و بەکۆمەڵەکان ڕابگیرێت.
- هەروەها ئەو منداڵانەی لە تەمەنێکی زووە لەسەر یاریکردن رادێن زیاتر کۆمەڵایەتیترن و زیاتر قابیلیەتی ئەوەیان هەیە کێشەکانی خۆیان بە دەستی خۆیان چارەسەر بکەن.

- یاریی فاکتەرێکە بۆ بەهێزکردنی منداڵ لە ڕووی لەش و جەستەوە.
- یاریی فاکتەرێکە بۆ بەهێزکردنی منداڵ لە ڕووی دەروونییەوە.
- یاریی فاکتەرێکە بۆ بەهێزکردنی منداڵ لە ڕووی هزرییەوە.
- یاریی فاکتەرێکە بۆ بەهێزکردنی منداڵ لە ڕووی ژیری و هۆشییەوە.
- یاریی فاکتەرێکە بۆ بەهێزکردنی منداڵ لە ڕووی زانستییەوە.
- یاریی فاکتەرێکە بۆ بەکۆمەڵایەتیکردنی منداڵ بەهۆی تێکەڵبوونی لەگەڵ خەڵك.
- یاریی فاکتەرێکە بۆ ڕاهاتنی منداڵ لەسەر داب و نەریتە باوەکانی نێو کۆمەڵگە.
- یاریی فاکتەرێکە بۆ ڕاهاتن لەسەر کۆمەڵە چەمکێکی بەهاداری وەکو: هاوکاری و هەرەوەزی و خۆنەویستی و هاوبەشی و هاوسۆزی و دڵسۆزی و پشتیوانی و تەبایی و لێبوردەیی و گەشبینی و...تاد.
- یاریی فاکتەرێکە بۆ ڕاهاتن لەسەر زمانپاراوی و رەوانبێژی.
- یاریی فاکتەرێکە بۆ دوورکەوتنەوە لە خەمۆکی و دڵتەنگی و نیگەرانی و دڵەتەپێ و ڕاڕایی.
- یاریی فاکتەرێکە بۆ دوورکەوتنەوە لە گرێیە سۆزداری و دەروونییەکان.
- یاریی فاکتەرێکە بۆ زیادبوونی کارامەیی داهێنان و ئەفراندن لە ناو ناخ و دڵ و دەروونی منداڵدا.

- یاریی فاکتەرێکە بۆ پشتبەخۆبەستن و بڕوابەخۆکردن.
- یـاریی فـاکتەرێکە بـۆ تواناسـازی و دۆزینەوەیـی شـیان و توانـا ماتەوزەکانی منداڵ.
- یـاریی فـاکتەرێکە بـۆ بەتـاڵکردنەوەی دەروون لە گرێیەکـانی سۆزداری و دەروونی و کێشە خێزانی و کۆمەڵایەتییەکان.
- یاریی فاکتەرێکە بۆ خۆناسین و خەڵك ناسین.
- یاریی فاکتەرێکە بۆ زاڵبوون بەسەر کێشە و قەیرانەکاندا.
- یاریی فاکتەرێکە بۆ خۆدەرخستن و زیرەکی و توند وتۆڵی و گورج و گۆڵی.
- یاریی فاکتەرێکە بۆ ئاشنابوون لەگەڵ یارییە جیاجیاکان.
- یاریی فاکتەرێکە بۆ دروستکردنی کێبڕکێیەکی شەریفانە لە نێوان تاکەکان و تیمەکان.
- یـاریی و جـووڵە باشـترین فـاکتەرن بـۆ پاراسـتنی تەندروسـتی و لەشجوانی.
- یاریی فاکتەرێکە بۆ پەیداکردنی دۆست و هاوڕێ.

## پەروەردەکردنی منداڵ بە دوو شێوازی جیاواز

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە پەیڕەوکردنی دوو شێوازی جیاواز لە پەروەردە و فێرکردندا، ئەمەش بۆ چەند هۆکارێک دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- کێشە و ناکۆکییەکانی دایک و باوک.
- جیاوازی ئاستی ڕۆشنبیری و زانستی دایک و باوک.
- گەورەبوونی دایک و باوک لە دوو ژینگەی جیاوازدا.
- ترسی دایک لە دڵڕەقییەکانی باوک.
- هەبوونی دیدگە و تێڕوانینی جیاواز بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان.
- درک نەکردنی دایک و باوک بە زیانەکانی ئەم کارە.
- ڕێکنەکەوتنی دایک و باوک لەسەر پەیڕەوکردنی یەک شێوازی پەروەردەیی.
- نزمی ئاستی ڕۆشنبیری و زانستی دایک و باوک.
- عینادیکردنی دایک یان باوک یان هەردووکیان دژی یەکتری.
- بەهرەمەندنەبوون لە ڕێنمایی و ڕاسپاردەکانی کەسانی شارەزا و پسپۆڕ لە بواری پەروەردە و فێرکردنی منداڵدا.

بێگومان ئەگەر دایک و باوک سوور بن لەسەر هەڵەی خۆیان و هەر یەکێکیان بە شێوازێك منداڵەکەیان پەروەردە بکات، زیانێکی زۆر بەدوای خۆیدا دێنێت، بەتایبەتی بۆ بە خودی منداڵ و خێزان و

کۆمەڵگە بەگشتی، گرنگترین ئەو زیانانەش کە لەسەر کەسایەتی منداڵ بەجێدێڵێت ئەمانەن:

- منداڵ دووچاری سەرلێشێوان دەبێت و نازانێ بۆچوون و شێوازی دایکی ڕاستە یان باوکی.
- متمانەی بە دایك و باوکی نامێنێ.
- دوو کەسایەتی لە خۆیدا بەرجەستە دەکات.
- زۆر هەڵە دەکات.
- نازانێ شتی ڕاست لە شتی هەڵە جیابکاتەوە.
- دەبێتە هۆکارێك کە ڕقی لە دایکی یان باوکی ببێتەوە، بەتایبەتی ئەوەی زیاتر لەسەری توند دەکات.
- ناتوانێ لەسەر قاچەکانی خۆی بوەستێ.
- توانای بڕیاردانی نابێت لەسەر مەسەلە چارەنووسسازەکان.
- دووچاری دوودڵی و دڕدۆنگی دەبێت.
- دووچاری بەدگومانی دەبێت.
- کەسێکی سەرکەوتوو نابێت.

### چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی دایك و باوك، منداڵ بەلاڕێدا نەبەن و پێکەوە بەرەو ئامانجەکانی ناراستەی بکەن، پێویستە خۆیان لە بەکارهێنانی دوو شێوازی جیاواز بەدووربگرن و لەسەر پەیڕەوکردنی یەك جۆرە شێوازی پەروەردەیی ڕێکبکەون و ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بهاوێژن:

- پێشوەخت لەسەر یەك جۆرە شێوازی پەروەردەکردن ڕێکبکەون.

- کاتێ ئامۆژگاری و ڕاسپاردە و ڕێنمایی ئاراستەی منداڵانی خۆیان دەکەن، نابێ دژی یەکتری و هاودژبن، بە جۆرێك، یەکێکیان بە منداڵ بڵێت بیکە، ئەوی دیکە پێی بڵێت نەیکە، واتە، دەبێ قسە و هەڵوێستیان یەك بێت و نەکەونە ململانێی یەکتری.
- نابێ دایك و باوك لە پێش چاوی منداڵ لۆمە و سەرزەنشتی یەکتری بکەن.
- دەبێ دایك و باوك دابنەخۆداگر بن و دووچاری هەڵچوون و تووڕەبوون نەبن.
- پێویستە سوود لە کەسانی شارەزا و پسپۆر وەربگرن.
- پێویستە هەماهەنگی و هاوکارییەکی باش لە نێوان دایك و باوك و قوتابخانەدا هەبێت.
- ئەگەر دایك یان باوك کارێکی بە منداڵ سپارد، نابێ ئەوی دیکەیان دژی بوەستێتەوە، یاخود کارێکی پێچەوانەی پێ بسپێرێت.

## سنووردارکردنی ئازادییەکانی منداڵ

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە سنووردارکردنی ئازادییەکانی منداڵ، یاخود کۆت و بەندکردنی ئازادییەکانی بەشێوەیەك، کە وا هەست بکات دەستبەسەرە و ناتوانێ بۆ ئەملا و ئەولا بڕوات.

ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- ترسی دایك و باوك لەوەی منداڵەکەیان دووچاری کارەساتێك یان ڕووداوێکی سروشتی یان هاتوچۆ ببێت و بەلایەکی بەسەر بێت.
- بڕوا و متمانەنەبوون بە منداڵ.
- زیاد لە حەد نازاندنی منداڵ.
- ترس لە ژینگەی کۆمەڵایەتی.
- هەبوونی کێشەی خێزانی و کۆمەڵایەتی.
- ئاشنانەبوون بە شێوازە دروستەکانی پەروەردە و فێرکردن.
- تاکڕەوی و خۆسەپاندن.
- گۆشەگیری و داخراویی.

ئەڵبەتە سنووردارکردنی ئازادییەکانی منداڵ دەبێتە هۆی ئەوەی کە کۆمەڵێك کێشە ڕووبەڕووی منداڵ ببێتەوە، گرنگترینیان ئەمانەن:

- منداڵ دووچاری نیگەرانی و دڵەڕاوکێ دەبێت.
- دەبێتە کەسێکی ترسنۆك.
- بڕوا و متمانەی بەخۆی نامێنێت.
- ویست و ئیرادەی نابێت.

- ناتوانێ پشت بەخۆی ببەستێت و هەمیشە پشت بە دایك و باوك و کەسە نزیکەکانی دەبەستێت.
- توانای خۆبەڕێوەبردنی نابێت.
- هەست بە بەرپرسیارەتی ناکات.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

پێویستە لەسەر دایك و باوك کە بەهیچ شێوەیەك ئازادییەکانی منداڵ سنووردار نەکەن و دەرفەتی پێ بدەن گوزارشت لە ئازادی خۆی بکات، بۆ ئەم مەبەستەش، دەبێ ئەم خاڵانەی خوارەوە لەبەرچاو بگرن:

- ئاشنا بن بە مافەکانی منداڵ.
- مافەکانی منداڵ دابین و مسۆگەر بکەن، کە گرنگترینیان ئازادییە.
- جیاوازی بکەن لە نێوان ئازادی و بەرەڵاییدا.
- ژینگەیەکی لەبار فەراهەم بکەن، بۆ ئەوەی گوزارشت لە ئازادی خۆی بکات.
- ڕێگەی پێ بدەن کە قسە بکات.
- ڕێگەی پێ بدەن کە یاریی بکات و بچێتە ناو دۆست و هاوڕێیانی.
- خۆیان لە عینادی و خۆسەپاندن بپارێزن.

## بەڕەڵاکردن و چاودێری نەکردنی منداڵ

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە بەڕەڵاکردنی منداڵەکانیان بۆ جادە و کۆڵانەکان، ئەم کارەش ڕێك پێچەوانەی سنووردارکردنی ئازادییەکانی منداڵە، ئەم حاڵەتەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- بێباکی و خەمساردی دایك و باوك.
- هەست نەکردن بە بەرپرسیارەتی.
- فرەکاری و سەرقاڵی دایك و باوك بەکارەوە.
- هەبوونی کێشە و بگرە و بەردەی خێزانی.
- نزمی ئاستی زانستی و پەروەردەیی دایك و باوك.
- ناشنانەبوونی دایك و باوك بە شێوازە ڕاستەکانی پەروەردە و فێرکردن.

بۆیە ئەگەر سنووری دارکردنی ئازادییەکانی منداڵ کارێکی نابەجێ و ناپەروەردەیی بێت، ئەوا بەڕەڵاکردنی منداڵ بۆ جادە و کۆڵانەکان، زیانی زۆر زیاتر، هەم بۆ خودی منداڵەکە، هەمیش بۆ خێزان و کۆمەڵگە، بۆیە هەردوو حاڵەتەکە هەڵەیە، جا چ سنووردارکردنی منداڵ بێت، یاخود بەڕەڵاکردنی منداڵ، چونکە لە هەردوو حاڵەتەکەدا منداڵ زەرەرمەند دەبێت،گرنگترین ئەو زیانانەش ئەمانەن:

- دووچاری تاوان و دەستدرێژی دەبێت.
- دەبێتە هاوڕێ و ڕەفیقی کەسانی خراپ.
- کەسێکی نابەرپرسی لێ دەردەچێت.

- ناتوانێ پشت بەخۆی ببەستێت.
- بەئاسانی کۆنترۆڵ ناکرێ.
- لە خوێندن و فێربوون دووردەکەوێ.
- خراپ بەکارهێنانی منداڵ، لەلایەن باندەکانی دزی و مادده هۆشبەرەکانەوە.
- دووچاری بەدڕەوشتی و بەدڕەفتاری دەبێ.
- بەئاسانی فێڵی لێدەکرێ.
- لە ژیانیدا سەرکەوتوو نابێ

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

پێویستە لەسەر دایك و باوك، کە خۆیان لە بەرەڵاکردنی منداڵ بەدووربگرن و بەرپرسانە ئەرکی پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانیان لە ئەستۆ بگرن، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە ئەم هەنگاوانە بهاوێژن:

- پلانیان هەبێت بۆ بەخێوکردنی منداڵەکانیان.
- منداڵەکانیان بەرەڵای جادە و کۆڵانەکان نەکەن.
- یەك جۆرە شێوازی پەروەردە بگرنەبەر.
- چاودێری و بەدواداچوون بۆ منداڵەکانیان بکەن.
- بزانن منداڵەکانیان لەگەڵ چ جۆرە کەسانێك و لە چ شوێنێك دەگەڕێن و دەسوڕێنەوە.
- کارەکانتان بەشێوەیەکی وا دابەش بکەن، کە یەکێکتان لە ماڵەوە بێت و ئەوی دیکەیان لە دەرەوە کار بکات، بۆ ئەوەی بۆشایی دروست نەبێت و منداڵ ئەو هەڵە نەقۆزێتەوە.

- هەست بە بەرپرسیارەتی بکەن.
- پەروەردەی ڕۆحی و مرۆڤدۆستی، بخەنە پێش پەروەردەی ماددییەوە.
- لەپێناو بەرژەوەندی منداڵەکانیان، کێشە و ناکۆکییەکانیان وەلاوەبنێن.

## چاوپۆشیکردن لە هەڵەکانی منداڵ

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە چاوپۆشیکردن لە هەڵەکانی منداڵ. واتە، منداڵ هەر هەڵەیەك بکات، ئەوان لەبری ئەوەی بۆی ڕاستکەنەوە و ڕێنمایی گرنگی پێ بدەن، تا دووبارە و چەندبارەی نەکاتەوە، کەچی چاوپۆشی لێ دەکەن و خۆیان لێ کڕ و کەڕ دەکەن! ئەمەش پەیتا پەیتا دەبێتە هۆی ئەوەی منداڵ لەسەر هەڵەکردن ڕابێت و بەردەوام بێت و ئەنجامدانی هەڵە، لای ببێتە کارێکی ئاسایی.

ئەم چاوپۆشیکردنەوەی دایك و باوکیش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- هەستنەکردن بە بەرپرسیارەتی.
- ناشنانەبوون بە شێوازە پەروەردەیەکان.
- نازاندنی منداڵ.
- هەبوونی کێشەی خێزانی.

- دڵناسکی و نزمی ئاستی ڕۆشنبیری و زانستی و پەروەردەیی دایک و باوک.
- دووری دایک و باوک لە ژینگەی شارستانی و مەدەنی.
- بەکارهێنانی منداڵ لە کێشە ناوخۆیەکانی خێزاندا.
- نەبوونی چاودێری بەسەر منداڵەوە.
- ڕاکردن لە ئەرک و بەرپرسیارەتی.

بێگومان چاوپۆشیکردن لە هەڵەکانی منداڵ، لەلایەن دایکان و باوکانەوە، ئەم زیانانە بۆ منداڵ بەدوای خۆیدا دێنێت:

- منداڵ هەڵەکانی خۆی دووبارە و چەند بارە دەکاتەوە.
- منداڵ هەڵە و ڕاستی لێکجیاناکاتەوە.
- تووشی کێشەو گرفت دەبێت، بەتایبەتی لە قوتابخانە و لە ناو هاوڕێیانیدا.
- بەئاسانی واز لە هەڵەکانی خۆی ناهێنێت و ڕاست ناکاتەوە.
- بەلارێدا دەچێت و گرفتار دەبێ.
- زیان بە گەشەی سۆزداری منداڵ دەگات.
- لەگەڵ هاوڕێ و هاوتەمەنەکانیدا ناگونجێت، بەتایبەتی لە قوتابخانە.
- کێشە بۆ خۆی و خێزانی دروست دەکات.
- لە ئەرک و کارەکانیدا سەرکەوتوو نابیت.

### چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

پێویستە لەسەر دایك و باوك لەگەڵ منداڵەکانیان لێبوردە بن، بەڵام هەرگیز چاوپۆشی لە هەڵەکانیان نەکەن، ئەمەش دوو شتی هاودژ نین، بەڵکو تەواوکەری یەکترین، بۆ نموونە ئەگەر منداڵێك بەهۆی هاوڕێ خراپەکانییەوە گیرۆدەی جگەرەکێشا بوو و دایك و باوکەکەی دڵنیابوون کە جگەرە دەکێشێت، پێویستە هەموو ڕێکارێکی پەروەردەیی بگرنەبەر بۆ ئەوەی نەهێڵن منداڵ لەسەر هەڵەکەی بەردەوام بێت، لەگەڵ ئەوەشدا پێی بڵێن کە چاوپۆشی لە هەڵەی پێشووترت دەکەین و لێت دەبورین، بەڵام بەمەرجێك ئەو هەڵەیە دووبارە و چەندبارە نەکەیتەوە.

هەروەها پێویستە دایك و باوك بۆ ئەم مەبەستە، ئەم هەنگاوانەی خوارەوەش بهاوێژن:

- هەست بەبەرپرسیارەتی بکەن.
- خەمسارد و کەمتەرخەم نەبن.
- بە شێوەیەکی پەروەردەیی منداڵ تێبگەیەنن، کە کاری هەڵە و ڕاست چییە.
- لە جیاتی خۆ بێدەنگ کردن لە ئاست هەڵەکانی منداڵدا، پێوەری سزا و پاداشت بەکاربهێنن، واتە منداڵی هەڵەکار، هەڵەکەی بۆ ڕاستبکرێتەوە و سزا بدرێت، منداڵ پابەندیش، پاداشت بکرێت و هان بدرێت.
- چاودێربن بەسەر کارەکانی منداڵەکانیانەوە.

- کاتێ هەڵەیەکیان لە منداڵەکانیان بینی، زوو زوو هەڵەکەیان بۆ ڕاست کەنەوە.
- نابێ ماوەیەکی زۆر بکەوێتە نێوان هەڵەی منداڵ و ئەو سزایەی کە بەسەریدا دەسەپێندرێت.
- ئاشنابن بە شێوازە پەروەردەیەکان، بۆ ئەوەی نەکەونە داوی هەڵە و تەڵەوە.

## خۆدزینەوە لە بەرپرسیارەتی

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە زۆرێك لە دایکان و باوکانی کۆمەڵگەی کوردەواری دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە خۆدزینەوە لە بەرپرسیارەتی و جێبەجێ نەکردنی ئەرکی دایکایەتی و باوکایەتی بەرامبەر بە منداڵەکانیان، ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- هەست نەکردن بە بەرپرسیارەتی.
- هەبوونی کێشەی خێزانی و کۆمەڵایەتی.
- نزمی ئاستی ڕۆشنبیری و زانستی دایك و باوك.
- ئاشنانەبوون بە شێوازە دروستەکانی پەروەردە و فێرکردن.
- خەمساردی و بێباکی.
- فرەکاری و هەژاری.
- نەبوونی هەستێکی مرۆڤدۆستانە.
- جێبەجێنەبوونی یاساکان.

- بێ ویژدانی و هەڵپەرستی و بەرژەوەندخوازی.

ئەڵبەتە خۆدزینەوەی دایك و باوك لە بەرپرسیارەتی بەرامبەر بە منداڵەکانیان، زیانێکی زۆر بە منداڵ بە تایبەتی و خێزان و کۆمەڵگە بەگشتی دەگەیەنێت، کە لەم چەند خاڵەدا چڕدەکەینەوە:

- منداڵ دەبێتە کەسێکی بەرەڵا و بێباك و خۆپەرست.
- هەست بەبەرپرسیارەتی ناکات.
- ناتوانێ پشت بە تواناکانی خۆی ببەستێت.
- دووچاری کێشە و بگرە و بەردەکانی ژیان دەبێت.
- دەکەوێتە زۆر هەڵە و تەڵەوە.
- دەبێتە منداڵێکی لاسار و سەرەڕوو و نەگونجاو.
- لە ژیان دا سەرکەوتوو نابێت.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی دایکان و باوکان چیتر لەسەر ئەم هەڵەیە بەردەوام نەبن و زیان بە بەرژەوەندی منداڵەکانیان نەگەیەنن، پێویستە ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بهاوێژن:

- پێویستە هەست بە بەرپرسیارەتی بکەن.
- دەبێ ئامانجیان هەبێت لە هەبوونی منداڵ و ئامانجەکانیشیان ڕۆشن و دیار بن.
- پلان و ستارتیژیان هەبێت بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکانیان.
- خەمسارد و کەمتەرخەم و بێباك نەبن.
- کار و ئەرکەکانی خۆیان بزانن.

- ئاشنابن بە مافەکانی منداڵ.
- منداڵ نەکەن بە قوربانی کار و ئیش.
- دڵسۆز و خەمخۆر بن بۆ منداڵەکانیان و خۆویست و خۆپەرست نەبن.
- نەهێڵن کێشەکان کاریگەری لەسەر پەروەردەکردنی منداڵ جێبێڵن.
- خۆیان ئاشنا بکەن لەسەر شێوازە پەروەردەیەکان.
- سوود لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و پەروەردەیی وەربگرن

## خراپ بەکارهێنانی پاداشت و سزا

ئەگەر پاداشت و سزا لە کات و شوێنی خۆیدا بەکاربهێندرێت، سوودێکی زۆر بەهەموو لایەك دەگەیەنێت، چونکە هەڵەی هەڵەکار ڕاست دەکرێتەوە، هەروەها هانی ئەو کەسەش دەدرێت کە ڕێڕەوێکی ڕاستی گرتووەتەبەر، بۆ ئەوەی لەسەر ئەو ڕێبازە ڕاستە بەردەوام بێت.

مخابن! هەندێ لە دایکان و باوکان بە هەڵە چەمکی پاداشت و سزا بەکاردەهێنن، بۆیە یەکێك لەو هەڵە باوانەی کە دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە خراپ بەکارهێنانی پاداشت و سزا بەرامبەر بە منداڵەکانیان، وانە منداڵەکانیان لەسەر هەندێ کار سزا دەدەن، کە شایستەی ئەو سزادانە نین، هەروەها لەسەر هەندێ کاریش پاداشت دەکرێن، کە نەدەبوو پاداشت بکرێن، ئەمەش زیاتر بۆ ئەم هۆکارانە دەگەڕێتەوە:

- نەزانین و نەشارەزایی دایکان و باوکان.
- نزمی ئاستی زانستی و پەروەردەیی دایك و باوك.
- ئاشنانەبوون بە پێوەرەکانی پاداشت و سزا.
- پەلەکردن لە بڕیاردان.
- پرس و ڕاوێژنەکردن بە یەکتری و کەسانی پسپۆر و شارەزا.
- تاکڕەوی و خۆسەپاندن.
- هەبوونی کێشەی خێزانی و لێکترازان و پێکەوە نەسازان.
- لێکتێنەگەیشتن و یەکتر نەخوێندنەوە.

بێگومان خراپبەکارهێنانی پاداشت و سزا، زیانێکی زۆری هەیە هەم بۆ منداڵ، هەمیش بۆ دایك و باوك و کۆمەڵگەش بە گشتی، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

- منداڵ هەست بە نادادپەروەری و ستەم دەکات.
- خۆدزینەوەی منداڵ لە ئەرك و بەرپرسیارەتی.
- هۆکارێکە بۆ تەمبەڵی و تەوەزەلی.
- ئاستەنگ و بەربەستێکە بۆ گەشەکردنی منداڵ.
- هۆکارێکە بۆ دروستکردنی بوغز و قین و ناکۆکی لە نێوان منداڵەکان و دایکان و باوکان.
- پاڵنەرێکە بۆ شەڕەنگێزی و توندوتیژی.
- دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی کێشە و ناکۆکی لە نێوان منداڵەکانیان.
- کاریگەرییەکی خراپ لەسەر دڵ و دەروونی سزادراو جێدێڵێت.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی دایکان و باوکان چیتر بەهەڵە سزا و پاداشت دژبەری منداڵەکانیان بەکارنەهێنن و لەسەر ئەم هەڵەیە بەردەوام نەبن، پێویستە ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بهاوێژن:

- دەبێ لە کات و ساتی خۆی دا منداڵ بهێنە سزادان، یان پاداشت کردن، واتە پێویستە دایك و باوك بزانن لە چ کاتێکدا منداڵ سزا

بدرێ و لە چ کاتێکیش پاداشت بکرێ، تا خراپ بەسەر ئەوان و منداڵەکانیاندا نەشکێتەوە.

- نابێ جێگۆڕکێ بە سزا و پاداشت بکرێت و بەخراپی کەڵکیان لێ وەربگیرێت.
- دەبێ لە سزا و پاداشتکردندا، زیادەڕەوی نەکرێت.
- دەبێ سزادان بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەیەك بێت و پاداشتیش بۆ هاندان بێت لەسەر بەردەوامبوون لەسەر ئەنجامدانی کارێکی باش.
- دەبێ کاتێکی زۆر بەسەر وادەی سزادانەکە یان پاداشتکردنەکەدا دەرباز نەبوو بێت.
- دەبێ منداڵ بزانێ بۆچی سزادراوە یان پاداشت کراوە، واتە هۆکارەکەی بۆ ڕوونبکرێتەوە.
- نابێ شێوازی سزادان و پاداشتکردنی منداڵ لەلایەن دایك و باوکییەوە هاودژ بێت و پێچەوانەی یەکتری بێت، واتە، دایك منداڵەکە سزا بدات، بەڵام باوك لەبری سزادان، پاداشتی بکات.
- دەبێ کاتێك منداڵ سزا یان پاداشت بکرێت، کە شایستەی ئەو سزادانە بێت

## بەكارهێنانی پێوەری بانیكە و دوو هەوا

هەڵەیەكی دیكە لەو هەڵە باوانەی كە زۆرێك لە دایكان و باوكان دەرهەق بە منداڵەكانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە بەكارهێنانی پێوەری بانێكە و دوو هەوا، واتە لەگەڵ منداڵكیان جۆرە سەرەدەرییەك دەكەن، كەچی لەگەڵ منداڵێكی دیكەیان جۆرە سەرەدەرییەكی جیا دەكەن، كە ١٠٠% جیاواز بێت.

بۆ نموونە: زۆرجار دایك و باوك ناز دەدەن بە منداڵێكی خۆیان و خۆشەویستی خۆیان بۆ دەردەبڕن، بەڵام منداڵێكی دیكە پشتگوێ دەخەن و نازی نادەنێ و فەرامۆشی دەكەن، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی كە منداڵی فەرامۆشكراو و پشتگوێخراو، هەست بە نادادپەروەری و ستەمكاری و جیاكاری بكات و بەچاوی ستەمكار و نادادپەروەر بڕوانێتە باوانەكانی.

هۆكاری ئەمەش بۆ چەند خاڵێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- نادادگەری و نادادپەروەری دایك و باوك یان یەكێكیان.
- دەكرێ دایك و باوكەكە ستەمكار بن.
- هەست نەكردن بە بەرپرسیارەتی.
- خۆشویستی هەندێك منداڵ لە هەندێكی دیكە.
- نەبوونی دیدگە و تێڕوانینێكی زانستییانە و بابەتییانە بۆ پەروەردە و فێركردنێ منداڵەكانیان.
- لاوازی ئاستی زانستی و پەروەردەیی دایك و باوك.
- بێبەشبوون لە پەروەردەیەكی تەندروست و مەدەنی.

ئەڵبەتە ڕەفتارکردن بە پێوەری بانێکە و دوو هەوا، ئەم هەموو زیانانە بەدوای خۆیدا دێنێت:

- منداڵ دەبێتە قوربانی ئەم جۆرە ڕەفتارە هەڵەیە.
- بڕوا و متمانەی بە دایك و باوکی نامێنێ.
- هەست بە ستەم و نادادگەری دەکات.
- ڕقی لە دایك و باوك و خوشك و براکانی دەبێتەوە.
- بڕوا و متمانەی بەخۆی نابێت.
- ناتوانێ پشت بە تواناکانی خۆی ببەستێت.
- هەست بە دڵتەنگی و نیگەرانی دەکات.
- هەست بە مافخوراوی دەکات.
- کێشە لە نێوان خودی منداڵەکان سەرهەڵدەدات.
- لە ژیاندا سەرکەوتوو نابێت.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە:

بۆ ئەوەی دایکان و باوکان چیتر بەهەڵە پێوەری بانێکە و دوو هەوا دژبەری منداڵەکانیان بەکارنەهێنن و لەسەر ئەم هەڵەیە بەردەوام نەبن، پێویستە ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بهاوێژن:

- بە یەك چاو سەیری هەموو منداڵەکانیان بکەن و جیاوازی لە نێوانیان دا نەکەن.
- دادپەروەر و دادگەر بن لە دابینکردنی پێداویستییە ماددی و مەعنەوییەکانی منداڵەکانیان.
- خۆیان لە فرە ڕەفتاری بپارێزن.

- هەماهەنگی و هاوکارییەکی پتەو لە نێوان دایك و باوکدا هەبێت.
- لە پێش چاوی منداڵەکانیان، پەنا بۆ فرە ڕەفتاری نەبەن.
- لە گوفتار و ڕەفتار و کرداریاندا ڕاستگۆ بن.
- جێی متمانە و باوەڕی منداڵەکانیان بن.
- لە پێش چاوی منداڵەکانیان، دوو شێوازی جیاوازی سەرەدەریکردن لەگەڵ منداڵەکانیان پەیڕەو نەکەن.

## شکاندنەوەی منداڵ لەناو دۆست و هاوڕێیانیدا

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە زۆرێك لە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە شکاندنەوەی منداڵەکانیان لە ناو دۆست و هاوڕێیانیاندا، ئەم کارەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- هەستنەکردن بەبەرپرسیارەتی.
- ناشنانەبوون بە شێوازە ڕاست و دروستەکانی پەروەردە و فێرکردن و تێگەیاندن و پێگەیاندن.
- نەبوونی ئارامی و پشوودرێژی.
- هەبوونی هەستی خۆبەکەمزانین
- پەنگواردنەوەی ڕق و قین لە ناخیاندا.
- پەنابردن بۆ توندوتیژی.
- خۆدەرخستن و خۆسەپاندن و تاکڕەوی.
- زاڵبوونی حەزی تۆڵەسەندنەوە لە ناخیاندا.
- چاولێکەری و کلکایەتی.
- خۆگەورەبینی.
- بەچاوێکی کەم سەیرکردنی منداڵ.

بێگومان شکاندنەوە و تەرقیکردنەوەی منداڵ، بەتایبەتی لە ناو دۆست و هاوڕێیانیدا، زیانێکی زۆری دەروونی و ڕۆحی و کەسایەتی و زانستی بە منداڵ دەگەیەنێت، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

- منداڵ هەست بە خۆبەکەمزانین دەکات.
- بڕوا و متمانەی بەخۆی نامێنێ.

- ناتوانێ پشت بە خۆی ببەستێت.
- کەسێکی گۆشەگیر و لاپەڕ و دوورەپەرێزی لێ دەردەچێت.
- هەست بە لاوازی دەکات.
- دووچاری دڵتەنگی و نیگەرانی و دڵەڕاوکێ دەبێت.
- ناتوانێ وەك کەسێکی دلێر و بوێر، بەرگری لە مافەکانی خۆی بکات.
- توانا زەینی و زانستی و هزرییەکانی وەك پێویست گەشە ناکەن.
- لە هاوڕێیانی دوا دەکەوێت.
- ناتوانێ خەون و ئامانجەکانی خۆی دەستەبەر بکات.
- ڕق و قین لەناو دڵ و دەروونیدا پەنگدەخواتەوە.
- هەستی تۆڵەسەندنەوە لای منداڵ چەکەرە دەکات.
- لە ژیاندا سەرکەوتوو نابێت.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی دایکان و باوکان چیتر منداڵەکانیان نەشکێننەوە و لەسەر ئەم هەڵەیە بەردەوام نەبن، پێویستە ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بهاوێژن:

- خۆیان لە جوێندان و وشەی هەستبریندارکەر بپارێزن، بەتایبەتی لە حزوری ئەوانی دیکەدا.
- ڕێز لە منداڵەکانیان بگرن، بەتایبەتی لەناو دۆست و هاوڕێکانیاندا.
- خۆیان لە هەر جۆرە توندوتیژییەك بەدوور بگرن.
- ئەگەر منداڵ هەڵەیەکی هەبوو، دەبێ ڕەخنە لە هەڵەی بگیرێت، نەك خۆی.

- دەبێ مافەکانی منداڵ پارێزراو بن.
- دەبێ منداڵ مافی ئەوەی هەبێت قسەبکات و بەرگری لە خۆی بکات.
- نابێ دایك و باوك ڕقنەستوور بن بەرامبەر بە منداڵەکانیان، بەڵکو دەبێ لێبوردە و بەخشەر بن.
- دەبێ دایك و باوك، ئارامی و ئاسوودەیی بە منداڵەکانیان ببەخشن.
- پێویستە بەتەنیا و دوور لە جەنجاڵی و قەڵەبالغی، لێپرسینەوە و لێپێچینەوە لەگەڵ منداڵەکانیان بکەن.

## تەرخاننەکردنی کاتی پێویست بۆ منداڵ

دابەشــکردنی کــات بەشــێوەیەکی هاوســەنگ بەســەر ئەرکەکانــدا، کارێکی زێدە گرنگە، چونکە هاوسەنگی نێوان (کات و کار)دەپارێزێ و هەموو شتێك بەشێوەیەکی رێکوپێك و ئاسایی بەرێوە دەچێت.

بــەڵام مخــابن زۆر کــەس، بەتایبــەتی دایکــان و باوکــان ئــەم هاوســەنگییە ناپــارێزن و بــەپێی پێویســتییەکانی ژیــان، کــات بەســەر کارەکاندا دابەش ناکەن.

ئەمەش وا دەکات کە کارەکانی بەشێوەیەکی هەڕەمەکی بەرێوە بچن و ئامانجی خۆیان نەپێکن.

هەموومان، بە دایك و باوکەکانیشەوە، کاتمان زۆرە بۆ ئیش و بازاڕ وگەشــت و ســەیران و گــەڕان و دانیشــتن بــەدیار درامــا و فیلمــە سینەمایەکانەوە، بــەڵام کاتمــان نییــە بــۆ ئــەوەی کاتژمێرێــك لەگــەڵ منداڵــەکانمان دابنیشــین و پێکــەوە جڤینێکــی دۆســتانە ســاز بکــەیــن و لەســەر زۆرێــك لــە بابــەت و تــەوەرە گرنگــەکانی ڤیــان و ژیــان دان و ستاندن بکەین و بیرورا بگۆڕینەوە.

بۆیە هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکــان دەرهــەق بــە منداڵــەکانیان ئــەنجامی دەدەن، بریتییــە لــە تەرخاننــەکردنی کــاتی پێویســت بــۆ منداڵــەکانیان، ئەمــەش بــۆ چەنــد هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- فرە کاری دایك و باوك و سەرقاڵبوونیان بە چەند کارێکەوە.
- هەست نەکردن بەبەرپرسیارەتی.
- بێباکی و خەمساردی.

- نەزانین و بێئاگایی.
- نزمی ئاستی ڕۆشنبیری و زانستی دایك و باوك.
- چاوچنۆکی و، ڕاکردن بەدوای کۆکردنەوەی پارە و ساماندا.
- پەی نەبردن بە گرنگی تەرخانکردنی کات بۆ منداڵ.

ئەڵبەتە تەرخان نەکردنی کاتی پێویست بۆ منداڵ لەلایەن دایك و باوکانەوە، زیانێکی زۆر بە منداڵ دەگەیەنێت، بەتایبەتی لە ڕووی دەروونی و کۆمەڵایەتییەوە، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

- منداڵ بەرەڵا دەبێ و دەبێتە منداڵی کۆڵان و شەقامەکان.
- هاوڕێیەتی ڕەفیقی خراپ دەکات.
- دووچاری کاری نابەجێ و ناشیاو دەبێ وەك: دزی و بەدڕەوشتی و لاساری و...تاد.
- خۆی لە بەرپرسیارەتی دەدزێتەوە و هەست بە بەرپرسیارەتی ناکات.
- دووچاری گرفتی کەسی و خێزانی و کۆمەڵایەتی دەبێت.
- بێبەش دەبێ لە سۆز و خۆشەویستی دایك و باوك.
- بەشێوەیەکی خراپ پەروەردە دەبێت.
- منداڵ ئەو دەرفەتە دەقۆزێتەوە، بۆ ئەوەی کاتی خۆی لە دەرەوە لەگەڵ هاوڕێیانی بەسەرببات.
- ناتوانێ پشت بە تواناکانی خۆی ببەستێت.
- لە خوێندن دوا دەکەوێ و هەندێ جار واز لە خوێندن دەهێنێ.
- لە ژیاندا ڕووبەڕووی شکستگەلێك دەبێ و سەرکەوتوو نابێ.

### چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی دایك و باوك کاتی خۆیان بە منداڵ ببەخشن و منداڵیش سوود لە کاتی دایك و باوکی وەربگرێت، دەبێ ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکرێت:

- هەبوونی پلانی پێشوەختە، بۆ ئەو مەبەستە.
- دەبێ کۆبوونەوەکان و دانیشتنەکان ئامانجدار بن.
- دەبێ دایك و باوك پێشتر لەسەر ناوەڕۆکی دانیشتنەکە ڕێکبکەون.
- ئەگەر دایکان و باوکان کاتیان دیاری کرد، باشتر وایە پابەند بن بە بەڵێنەکانیانە.
- دەبێ لە دانیشتنەکاندا دان و ستاندن و گفتوگۆیەکی هێمانە لەسەر بابەتەکان بکرێت و منداڵیش مافی قسەکردن و ڕادەربڕینی هەبێت.
- دەبێ هانی منداڵەکان بدرێت بۆ ئەوەی گۆزارشت لە بیروڕاکانیان بکەن و ئەوەی لە ناخیاندا هەیە بخەنە ڕوو.

## ترساندنی منداڵ بە کەسێکی دیکە

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە گەورانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە ترساندنی منداڵ بەکەسێکی دیکە، بۆ نموونە دایک یان باوك منداڵ بە گیاندارێکی درندە دەترسێنێ وەك: گورگ یان سەگ یان ورچ و یان شێر و ...تاد. یاخود بە مرۆڤێك دەترسێنێ کە کەسێکی تۆقێنەر بێت یان ناوبانگێکی خراپی هەبێت یان ستەمکار بێت، یاخود بە برا گەورەکەی یان مامی یان خاڵی یان باپیری و...تاد. بۆ ئەوەی منداڵەکەی کۆنترۆڵ بکات و سنوورێکی بۆ دابنێت، بەڵام ئەم کارە خۆی لە خۆیدا کارێکی زۆر بڤە و مەترسیدارە، چونکە زیانێکی زۆر بە خودی منداڵەکە دەگەیەنێت و ئەو ڕاستییەش دەسەلمێنێ کە باوك یان دایك یاخود هەردووکیان لە پەروەردەکردنی منداڵەکەیاندا شکستیان خواردووە و نەیانتوانیوە خۆیان ئەم ئەرکە بگرنە ئەستۆ، بۆیە پەنایان بۆ کەسێك بردووە، لە دەرەوەی بازنەی خێزان، هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ:

- لاوازی و بێ ئیرادەیی دایك و باوك.
- لاوازی کەسایەتی دایك و باوك.
- ناوشیاری و بێئاگایی.
- نابەرپرسی و بێباکی.
- نەزانین و نەفامانادن.
- هەست نەکردن بە بەرپرسیارەتی.
- شان نەدانە بەر ئەرك و بەرپرسیارەتی.
- بڕوا و متمانە بەخۆنەبوون.

- کۆلەواری و بێدەسەڵاتی.

ئەڵبەتە ئەم جۆرە ترساندنە زیانێکی زۆری هەیە، بەتایبەتی بۆ خودی منداڵ و دایك و باوکیشی، کە گرنگترینیان ئەم خاڵانەی خوارەوەن:

- منداڵ دەبێتە کەسێکی ترسنۆك و بێ هەڵوێست.
- منداڵ ناتوانێ پشت بەخۆی و دایك و باوکی ببەستێت.
- دایك و باوکەکان لەپێش چاوی منداڵەکانیان بچووك دەبنەوە.
- لاوازی و بێدەسەڵاتی دایك و باوك دەردەخات لە چارەسەرکردنی کێشە و گرفتەکاندا.
- منداڵ لە کار و ئەرکەکانی دا سەرکەوتوو نابێت.
- منداڵ دووچاری ترس و دڵەڕاوکێ و نیگەرانی دەبێت.
- منداڵ ناتوانێ بەرگری لە مافەکانی خۆی بکات.

### چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی دایکان و باوکان چیتر منداڵەکانیان نەترسێنن و لەسەر ئەم هەڵەیە بەردەوام نەبن، پێویستە ئەم خاڵانەی خوارەوە جێبەجێ بکەن:

- خۆپاراستن لە گشت جۆرە ترساندنێك.
- نابێ منداڵ بە کەسێکی دیکە بێتە ترساندن.
- لە ئەستۆگرتنی ئەرکی بەخێوکردنی منداڵ.
- خۆنەدزینەوە لە بەرپرسیارەتی.
- دۆزینەوەی جێگرەوەی ترس و تۆقاندن.

- خۆ ئاشناکردن بە شێوازە پەروەردەیەکان.
- فەراهەمکردنی زەمینەیەکی لەبار بۆ پەروەردە و فێرکردن و تێگەیاندن و پێگەیانی منداڵ بەشێوەیەکی بابەتییانە و زانستییانە.

## داماڵینی منداڵ لە دەسەڵات و بەرپرسیارەتی

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە گەورانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە داماڵینی منداڵ لە دەسەڵات و بەرپرسیارەتی، ئەمەش بۆ چەند هۆکارێکی جیاجیا دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- بیرتەسکی و نەزانی.
- خۆبەزلزانی و لەخۆباییبوون.
- نەشارەزایی و کەم ئەزموونی.
- هەست نەکردن بە بەرپرسیارەتی.
- ڕاکردن لە ئەرک و بەرپرسیارەتی.
- چاولێکەری و لاساییکردنەوەی کوێرانە.
- کولتوور و داب و نەریتە باوەکانی کۆمەڵگە.
- بەچاوی کەم سەیرکردنی منداڵ.
- ئاشنا نەبوون بە مافەکانی منداڵ.
- پێشێلکردنی مافەکانی منداڵ.
- ئاشنانەبوون بە شێوازە پەروەردەیی و زانستییەکان.
- هەبوونی کێشەی خێزانی و کۆمەڵایەتی و ئابووری.

- هەبوونی ناکۆکی و بگرە بەردە و مشتومڕ لە نێوان دایک و باوک.

بێگومان شەلاندن و دامالینی منداڵ لە هەموو دەسەڵات و بەرپرسیارەتییەک، نەک هەر زیانی بۆ منداڵ دەبێت، بگرە دایک و باوک و خێزان و کۆمەڵگەش ڕووبەڕووی زەرەرە و زیانێکی زۆر دەبنەوە، گرنگترین ئەو زیانانەش ئەمانەن:

- منداڵ هەست بە خۆبەکەمزانین دەکات.
- بڕوا و متمانەی بە خۆی نابێت.
- هەست بە بەرپرسیارەتی ناکات.
- خەمسارد دەبێت لە جێبەجێکردنی ئەرک و کارەکانیدا.
- هەست بە غەدر و ستەم دەکات.
- ناتوانێ پشت بە خۆی ببەستێت.
- کەسێکی سەرکەوتوو نابێت لە ژیاندا.
- کۆمەڵگە وەک پێویست ناتوانێ سوود لە توانا و بەهرەکانی ئەم جۆرە منداڵانە وەربگرێت.
- دایک و باوک ناتوانن لە توانا و بەرهەکانی منداڵەکانیان بەهرەمەند بن.
- ئەم جۆرە منداڵانە کە هیچ جۆرە بەرپرسیارەتییەکیان پێ ناسپێردرێت، دەبنە بار لەسەر شانی خێزان و کۆمەڵگە.

**چارسەرکردنی ئەم هەڵەیە**

بۆ ئەوەی دایکان و باوکان لەسەر هەڵەی خۆیان بەردەوام نەبن و لەمەودوا بتوانن گەشە بە توانا و بەهرەی منداڵەکانیان بدەن، تاکو پشت بە تواناکانی خۆیان ببەستن و هەست بە بەرپرسیارەتی بکەن و بەرپرسیارەتی وەرگر بن، پێویستە ئەم خاڵانەی خوارەوە جێبەجێ بکەن:

- بەپێی تەمەن و قۆناغی گەشەکردنیان، دەسەڵات و بەرپرسیارەتییان پێ ببەخشن.
- خۆیان لە قورغکاری و خۆسەپاندن بپارێزن.
- ئارام و دابەخۆداگر بن.
- بەرپرسانە ڕەفتار و سەردەری لەگەڵ منداڵەکانیان بکەن.
- منداڵەکانیان ڕابێنن لەسەر چەمکی بەرپرسیارەتی هاوبەش و دەستەجەمعی.
- خۆیان لەهەر جۆرە توندوتیژییەك بەدوور بگرن.
- ڕێز لە ماف و تواناکانی منداڵ بگرن.
- زەمینەسازی بکەن بۆ گەشەکردنی توانا و بەهرەکانی منداڵەکانیان.
- پێوەری پاداشت و سزا بەکاربهێنن لە ژیانی ڕۆژانەیاندا.
- دەبێ منداڵ هێندە ئازاد بێت، کە بتوانێ بچێتە دەرەوە و یاری و وەرزشت بکات

## سەرەدەریکردن لەگەڵ منداڵ
## وەک کەسێکی گەورە نەک وەک خۆی

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە سەرەدەریکردن لەگەڵ منداڵ وەك کەسێکی گەورە، نەك وەك خۆی، واتە، دایك و باوك بەبێ ڕەچاوکردنی تەمەن و قۆناغی گەشەکردن، سەرەدەری لەگەڵ منداڵ دەکەن و زۆرجار نازانن یاخود بێئاگان لەوەی کە ئەو کەسەی ئەوان سەرەدەری لەگەڵیدا دەکەن منداڵە، نەك کەسێکی گەورە، ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، گرنگترینیان:

- کەم ئەزموونی و نەشارەزایی دایك و باوك لەبارەی کەسایەتی منداڵەوە.
- ئاشنانەبوونی دایك بە قۆناغەکانی گەشەکردنی منداڵ.
- بێئاگابوون لە پێداویستییە دەروونی و زانستییەکانی منداڵ.
- ئاشنانەبوون بە مافەکانی منداڵ.
- بەهەڵە خوێندنەوەی منداڵ.
- لاسایی کردنەوەی کەسانی دیکە.
- هەبوونی چاوەڕوانی لە منداڵ، زیاد لە حەد و ئەندازەی خۆی.
- هەبوونی داواکاری نابەجێ و دوور لە ڕاستی.

ئەمـەش زیـانێکی زۆر بـە منـداڵ دەگەیـەنێت، گرنگتـرین ئـەو زیانانەش ئەمانەن:

- منداڵ دووچاری کێشەی دەروونی و کەسایەتی دەبێت.
- ناتوانێ لە ئاست چاوەڕوانییەکانی دایك و باوکی و ئەوانی دیکەدا بێت.
- ڕووبەڕووی شکست دەبێتەوە.
- بارێکی قورس و گران دەکەوێتە سەر شانی ئەو.
- زۆر هەڵە دەکات.
- لە کار و ئەرکەکانی دا سەرکەوتوو نابێت.
- ناتوانێ بەرگەی ناخۆشی و ئاستەنگەکانی ژیان بگرێت.
- کاریگـەری لەسـەر گەشـەی دەروونـی و هـزری و زانسـتی منـداڵ دەبێت.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

بـۆ ئـەوەی دایکـان و باوکـان هەڵـەی خۆیـان دوویـارە و چەنـدبارە نەکەنەوە و بەشێوەیەکی واقعبینانە سـەرەدەری لەگەڵ منداڵ بکەن و وەك کەسێکی مەزن سەیری نەکەن، بەڵکو وەك منداڵ ڕەفتاری لەگەڵ دا بکەن، پێویستە ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بهاوێژن:

- دەبێ دایك و باوك ئاشنا بن بە قۆناغەکانی گەشەکردنی منداڵ.
- دەبێ دایك و باوك دان بە منداڵێتی منداڵ دابنێنن.
- دەبێ کارێك بە منداڵ بسپێرن کە بەدەر نەبێت لە تواناکانی.
- نابێ منداڵ بۆ بەرژەوەندی ئابووری بێتە بەکارهێنان.

- دەبێ دایك و باوك بتوانن ناخی منداڵەكانی خۆیان بخوێننەوە.
- دەبێ ئاشنا بن بە تایبەتمەندییەكانی منداڵ.
- نابێ وەك كەسێكی گەورە چاوەڕوانییان لە منداڵ هەبێت.

## لە بەرچاونەگرتنی تایبەتمەندی و جیاتاكییەكانی منداڵ

هەڵەیەكی دیكە لەو هەڵە گەورانەی كە زۆرێك لە دایكان و باوكان دەرهەق بە منداڵەكانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە لەبەرچاونەگرتنی تایبەتمەندی و جیاتاكییەكانی منداڵ، ئەمەش بۆ كۆمەڵێك هۆكار دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- نەزانین و نەشارەزایی دایك و باوك بە فەلسەفەی پەروەردە و فێركردن.
- هەبوونی كێشەی خێزانی.
- ئاشنانەبوون بە قۆناغەكانی گەشەكردنی منداڵ.
- چاولێكەری كوێرانە.
- نزمی ئاستی زانستی و پەروەردەیی و ڕۆشنبیری دایك و باوك.
- ئاشنانەبوون بە بنەما زانستی و پەروەردەییەكان.
- بەهەندوەرنەگرتنی بەها ڕەوشتی و پەروەردەیی و زانستییەكان.
- نەبوونی پەروەردەیەكی تەندروست لە ناو خێزاندا.

ئەڵبەتە زانایان پێیان وایە قۆناغی منداڵی گرنگترین و هەستیارترین قۆناغی گەشەكردنی مرۆڤە، بۆیە ئەگەر تایبەتمەندی و جیاتاكییەكانی منداڵ بێنە بەرچاوگرتن و بە شێوەیەكی زانستییانە و

بابەتییانە بێتە پەروەردەکردن و تێگەیاندن و پێگەیاندن، ئەوا بێگومان لە قۆناغەکانی دیکەش دا سەرکەوتوو دەبێت و دەتوانێ لە گشت کایەکانی ژیان دا ئەسپی خۆی تاو بدات، بەڵام ئەگەر تایبەتمەندی و جیاتاکییەکانی منداڵ نەهێنە بەرچاوگرتن و بەشێوەیەکی نازانستییانە و ناپەروەردەیانە هاتە پەروەردەکردن، ئەوا بێگومان کاریگەرییەکی نەرێنی لەسەر باقی قۆناغەکانی دیکەی ژیانی جێدێڵێت، بۆیە لە بەرچاونەگرتنی تایبەتمەندی و جیاتاکییەکانی منداڵ زیانێکی زۆر بەخودی منداڵ دەگەیەنێت، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

- لە ئەنجامی لە بەرچاونەگرتنی تایبەتمەندی و جیاتاکییەکانی منداڵ، دەکرێ منداڵ ڕووبەڕووی کۆمەڵێك نەخۆشیی ڕەوشتی و جەستەیی و دەروونی ببێتەوە، وەك: دزی، درۆ، ترس، تووڕەیی، قەڵەوی، دڵتەنگی، نیگەرانی، دڵەڕاوکێ، خەمۆکی و پەریشانی و...تاد.
- بێبەش بوون لە بەهرە و تواناکانی خۆی.
- ڕاکردن لە بەرپرسیارەتی.
- خۆدزینەوە لە ئەرك و کارەکانی.
- بڕوابەخۆنەبوون.
- ناتوانێ پشت بە تواناکانی خۆی ببەستێت.
- ناتوانێ پەی بە توانا و بەهرەکانی خۆی ببات.
- لە هاوڕێیانی دوادەکەوێت.
- کەسێکی تەمبەڵ و تەوەزەل دەبێت.
- لە خوێندندا سەرکەوتوو نابێت.

- لە ژیاندا ڕووبەڕووی شکست دەبێتەوە.

## چارسەرکردنی ئەم هەڵەیە:

بۆ ئەوەی دایکان و باوکان چیتر تایبەتمەندی و جیاتاکییەکانی منداڵ فەرامۆش نەکەن و ئەو هەڵەیە دووبارە و چەندبارەی نەکەنەوە و بەشێوەیەکی واقعبینانە سەرەدەری لەگەڵ منداڵ بکەن، پێویستە ئەم هەنگاوانەی خوارەوە هەڵگرن:

- دەبێ ئاشنا بن بە فەلسەفەی پەروەردەکردنی منداڵ.
- دەبێ ئاشنا بن بە قۆناغەکانی گەشەکردنی منداڵ.
- دەبێ پێداویستییە دەروونی و جەستەیەکانی منداڵ دابین بکەن.
- دەبێ پەی بە توانا و بەهرەکانی منداڵەکانیان ببەن.
- دەبێ لەسەر هەمان بابەت، پرس و ڕاوێژ بە کەسانی شارەزا و پسپۆر بکەن.
- دەبێ هەست بە بەرپرسیارەتی بکەن.
- نابێ خۆیان لە ئەرك و کارەکانیان بدزنەوە.
- لە کاتی سەرەدەریکردندا، دەبێ تایبەتمەندی و جیاتاکییەکانی منداڵان بناسن و لەبەرچاو بگرن.
- دەبێ بەشێوەیەکی زانستییانە و بابەتییانە و پەروەردەییانە سەردەری لەگەڵ منداڵ بکەن.
- دەبێ کار بکەن بۆ دۆزینەوەی خاڵە بەهێز و لاوازەکانیان، بۆ ئەوەی پەرە بە خاڵە بەهێزەکانیان بدرێت و خاڵە لاوازەکانیشیان بەهێز بکرێت.

- دەبێ هاندەری سەرەکی بن بۆ گەشەدان بە بەهرە و تواناکانی منداڵەکانیان.
- دەرگای ئاسانکاری بخەنە سەر پشت بۆ سەرکەوتنی منداڵ لە گشت کایەکانی ژیاندا.

## پەلەکردن لە بڕیاردان

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە گەورانەی کە زۆرێك لە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە پەڵەکردن لە بڕیاردان، لەکاتی پەروەردەکردنیاندا، واتە بڕیارێك دەدەن کە لە شوێنی خۆیدا نەبێت و زیانی لە قازانجی زۆرتر بێت، یان بڕیارێك دەدەن، پێشتر پرس و ڕاوێژیان بەیەکتری نەکردبێت،یان بڕیارێکی بە هەڵە و بلەز دەدەن، بەبێ دراسەکردن و لێکۆڵینەوە، ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- ئەنجامدانی کاری هەڕەمەکی و بیرنەکردنەوە لە ئەنجامی کارەکان.
- نەبوونی ئامانجێکی دیاریکراو.
- پرس و ڕاوێژنەکردن.
- خۆدزینەوە لە بەرپرسیارەتی.
- قەزاوەت کردن لەسەر ڕواڵەت، نەك ناوەڕۆك.
- تاوتوێ نەکردنی کێشە و ئارێشەکان.
- لاسایی کردنەوەی کوێرانە و نازانستی.

- تووڕەیی و دان بەخۆدانە کرتن.
- هەڵچوون و هەڵپەیی.
- هۆکاری سەردەمی منداڵی و بەجێهێشتنی کاریگەری نەرێنی لەسەر دایك و باوك.
- هۆکاری بۆماوەیی و هەبوونی نەخۆشی جەستەیی و دەروونی.

ئەڵبەتە پەلەکردن لە بڕیاردان لەکاتی پەروەردەکردنی منداڵ، هەم زیانی بۆ خودی دایك و باوك و خێزان و کۆمەڵگە هەیە، هەمیش بۆ منداڵ، کە دەتوانین لە چەند خاڵێکدا بخەینە ڕوو:

- زیانی ماددی و مەعنەوەی بەدوای خۆیدا دێنێت.
- دایك و باوك زۆربەی جار ناتوانن ئامانجی خۆیان بپێکن.
- بڕیاری هەڵە کاری هەڵە بەدوای خۆیدا دێنێت.
- بەرژەوەندی هەموو لایەك دەکەوێتە مەترسییەوە.
- بڕیاری هەڵە باری سەر شانی دایك و باوك قورستر دەکات.
- نیشانەی ناواقعیبینی دایك و باوکە.
- بڕیاری هەڵە کاریگەری نەرێنی لەسەر گەشەی هزری و جەستەیی و دەروونی و زانستی و کەسۆکی منداڵ جێدێڵێت.
- کۆمەڵگە بەرەو هەڵدێر دەبات.
- بڕیاردان بە هەڵەشەیی ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێ کە دایك و باوك پلانیان نییە بۆ ژیان بەگشتی و، بۆ پەروەردە و فێرکردنی منداڵ بەتایبەتی.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی دایك و باوك بڕیاری بە پەڵە و هەڵە نەدەن و زیان بە خۆیان و منداڵەکانیان و کۆمەڵگەش نەگەیەنن، پێویستە ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بهاوێژن:

- پێویستە دایکان و باوکان بۆ پەژراندنی هەر بڕیارێك، پلانیان هەبێت.
- دەبێ هەر پلانێك ئامانجێك یان چەند ئامانجێکی هەبێت.
- دەبێ دایکان و باوکان پێش هەر بڕیارێك، پرس و ڕاوێژ بە یەکتری بکەن.
- پێویستە دایکان و باوکان هاوبەشن بن لە بڕیار دان، بۆ ئەوەی هاوسەنگی لە ژیاندا هەبێت.
- دەبێ دایك و باوك قەت پەڵە نەکەن لە بڕیاردان.
- پێویستە دایك و باوك پێش هەر بڕیاردانێك، هەموو ئەگەرەکان تاوتوێ بکەن، تاکو بڕیاری هەڵە نەدەن.
- لەکاتی پێویست، پرس و ڕاوێژ بە کەسانی شارەزا بکەن.
- پێویستە دایك و باوك پێش هەر بڕیارێك، بە قووڵی بیر لە دەرەنجامەکانی بکەنەوە.
- لە هەموو حاڵەتێکدا، دەبێ بەرژەوەندی خێزان بەگشتی و بەرژەوەندی منداڵ بەتایبەتی، لەبەرچاو بگیرێت.
- نابێ لە کاتی تووڕەیی، یان نەخۆشی یان شڵەژانی دەروونی، هیچ بڕیارێك بدرێت.

- دەبێ هەموو بڕیارێك ئامانج و پلانی خۆی هەبێت و بتوانێ مەبەستی خۆی بپێكێت.
- دەبێ ئەو ژینگەیەی بڕیاری تێدا دەدرێت گونجاو بێت و تا بكرێت بە ناچاری بڕیار نەدرێت.
- بۆ هەر بڕیارێك كە دایك و باوك دەیدەن، پێویست خۆیان بە خاوەنی بڕیارەكە بزانن و ئەو بەرپرسیارەتە بگرنە ئەستۆ.

## خستنەڕووی خراپەكانی منداڵ و فەرامۆشكردنی چاكەكانی

هەڵەیەكی دیكە لەو هەڵە باوانەی كە هەندێ لە دایكان و باوكان دەرهەق بە منداڵەكانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە خستنەڕووی خراپەكانیان و فەرامۆشكردنی چاكەكانیان، واتە حەزیان لەوەیە لای خەڵكی بەگشتی و دۆست و هاوڕێیانی منداڵەكانیان بەتایبەتی، باس لە خراپەی منداڵەكانیان بكەن و چاكەكانیشیان نادیدە بگرن، ئەمەش بۆ چەند هۆكارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- نەزانین و نەشارەزایی دایك و باوك.
- نەخوێندەواری و نزمی ئاستی زانستی دایك و باوك.
- ئاشنانەبوون بە شێوازە دروستەكانی پەروەردە و فێركردن.
- نەبوونی كۆنترۆڵ لەسەر هەست و دەروونی خۆیان و پەلەكردن لە بڕیاردان.
- خۆشباوەری دایك و باوك.
- كاریگەری نەرێنی كولتوور و داب و نەریت لەسەر ئەوان.

- فشاره خێزانی و کۆمەڵایەتی و دەروونی و ئابوورییەکان.
- جیاوازی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری دایك و باوك.
- هەبوونی گرێی دەروونی.

ئەڵبەتە هەموو ئەمانە و هۆکارەکانی دیکەش وا دەکات کەوا زیانێکی زێدە بە منداڵ بگات و کاریگەرییەکی نەرێنی لەسەر گەشەی هزری و زانستی و کۆمەڵایەتی و دەروونی ئەو جێبهێڵێت، گرنگترین ئەو زیانانەش ئەمانەن:

- منداڵ بڕوای بە خۆی و دایك و باوکی و دەوروبەری نامێنێ.
- دەبێتە کەسێکی ترسنۆك و ورەبەزیو.
- کەسێکی شەرمنی لێ دەردەچێت.
- دەبێتە کەسێکی گۆشەگیر و دوورەپەرێز و لاپەڕ.
- متمانەی بە تواناکانی خۆی نابێت.
- تووشی بەدگومانی و دڵپیسی دەبێت.
- هەست بەخۆکەمزانین دەکات.
- هەست بە شڵەژان و داڕووخانی دەروونی دەکات.
- لە ژیانی خۆیدا سەرکەوتوو نابێت.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی دایك و باوك بەم تیرە هەستی منداڵەکانیان بریندار نەکەن و هەڵەی خۆیان ڕاستکەنەوە، پێویستە ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بنێنن:

- هیچ هەڵە و کەموکوڕی و خراپەیەکی منداڵەکانیان لای هیچ کەسێك باس نەکەن، ئەگەر حاڵەتێکی ئاواش هاتەپێش، پێویستە

بەتەنیا لەگەڵیان دانیشن و بە شێوەیەکی پەروەردەیی و دوور لە تەرقیکردنەوە و شکاندنەوە پێیان بڵێن.

- هەمیشە چاکەکانیان بخەنە ڕوو، بۆ ئەوەی هانبدرێن و بەردەوام بن لەسەر چاکەکردن.
- پەلە و لەز نەکەن لە بڕیاردان.
- خۆیان ئاشناکەن بە شێوازە پەروەردەیەکان.
- بیر لە تۆڵەسەندنەوە و شکاندنەوەی نەوەکانیان نەکەنەوە.
- مەبەست لە سزادان، ڕاستکردنەوە بێت نەك شکاندنەوە.
- خۆشەویستی ببێتە بەردی بناغەی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ منداڵەکانیان.

## لاوازیی پەیوەندیی نێوان دایک و باوک و منداڵ

هەبوونی پەیوەندییەکی توندو توڵ و پتەو لە نێوان دایکان و باوکان و منداڵەکانیان، نەک هەر کارێکی باشە، بگرە زۆر پێویستیشە، چونکە هەبوونی ئەم جۆرە پەیوەندییە دەبێتە بەردی بناغەی خۆشەویستی و هاوکاری و لێکتێگەیشتن و پێکەوە هەڵکردن. وەلێ مخابن! هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە لاوازی پەیوەندی نێوان ئەوان و منداڵەکانیان، واتە، پەیوەندییەکە هێندە لاوازە، لەسەر لێواری پچڕان و دابڕاندایە، بە پلەی یەکەمیش باوان بەرپرسیارن!

هۆکارەکەیشی بۆ چەند خاڵێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- دووری دایك یان باوك یان هەردووکیان لە منداڵەکانیان، بەهۆی کۆچ یان نەخۆشی، یان کار یاخود هەر حاڵەتێکی دیکەی لەو جۆرە .
- بێ بەزەیی و دڵڕەقی دایك و باوك.
- هەستنەکردن بەبەرپرسیارەتی.
- دڵڕەقی و توندوتیژی دایك و باوك بەرامبەر بە منداڵەکانیان.
- خۆدزینەوە لە ئەرك و کارەکانیان.
- ناشنانەبوونیان بە شێوازە دروستەکانی پەروەردە و فێرکردن و نەبوونی ڕۆشنبیری پەروەردەیی.
- گۆشەگیری و دوورەپەرێزی دایك و باوك لە خەڵك.
- هەبوونی کێشەی خێزانی و کۆمەڵایەتی.
- هەبوونی نەخۆشی و ناخۆشی دەروونی و جەستەیی.

- هەژاری و فرەکاری.

بێگومان هەبوونی پەیوەندییەکی لاواز لە نێوان و باوان و منداڵەکانیان، زیانێکی زۆر بە خودی باوان و خێزان و کۆمەڵگە و منداڵەکانیان دەگەیەنێت، کە ئەو زیانانە لە چەند خاڵێکدا چڕدەکەینەوە:

- منداڵ متمانەی بە دایك و باوکی نامێنێ.
- منداڵ ناتوانێ پشت بە توانا و بەهرەکانی خۆی ببەستێت و متمانەی بەخۆی نامێنێ.
- منداڵ هەست بە نیگەرانی و دڵەڕاوکێ و خەمباری دەکات.
- منداڵ هەست بە ترس و بیم دەکات.
- هەست و سۆزی منداڵ بەرامبەر بە دایك و باوکی لاواز دەبێ.
- منداڵ لە دایك و باوکی دوور دەکەوێتەوە.
- منداڵ دەبێتە کەسێکی گۆشەگیر و دوورەپەرێز.
- منداڵ دەبێتە هاوڕێی کەسانی خراپ و لاسار و سەرەڕۆ.
- منداڵ هەست بە بەپرسیارەتی ناکات.
- منداڵ لە دروستکردنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ خزم و کەس و هاوڕێیانیدا سەرکەوتوو نابێت.
- منداڵ ناتوانێ بە شێوەیەکی تەندروست گەشە بکات، چونکە نەبوونی پەیوەندییەکی تەندروست لەگەڵ ماڵەوە و ژینگەی قوتابخانە و دەرەوە، کاریگەرییەکی نەرێنی لەسەر کەسایەتی ئەو جێدێڵێت.
- دایك و باوك و منداڵ بە چاوی گومانەوە سەیری یەکتری دەکەن.

- خێزان و کۆمەڵگە لە توانا و بەهرەکانی ئەم جۆرە منداڵانە بێبەش دەبن.
- لاوازیی ئەم جۆرە پەیوەندییە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی کێشە و سەرئێشە بۆ خێزان و کۆمەڵگە، هەروەها دەبێتە هۆی پەرتەوازەیی کۆمەڵایەتی و خێزانی وماڵجیایی ئەندامانی خێزان.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی دایک و باوک پردێکی پتەوی پەیوەندی لەگەڵ منداڵەکانیان دروست بکەن و لە ڕێگەی ئەو پەیوەندییەوە نەوەیەکی دانا و زانا و بەتوانا و وشیار و بێدار و تێگەیشتوو و پێگەیشتوو پێشکەش بە کۆمەڵگە بکەن، دەبێ بە پەیوەندییە نەرێنی و لاوازەکانی خۆیاندا بچنەوە و ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بهاوێژن:

- دەبێ پەیوەندی باوان لەگەڵ منداڵەکانیان لەسەر بناغەی خۆشەویستی و ڕێزگرتن و لێبوردەیی بێت و بەردەوام بێت.
- نابێ باوان لە سەرەدەریکردنیاندا لەگەڵ منداڵەکانیان، پەنا بۆ قسەی زبر و ڕەق ببەن.
- دەبێ کێشەکانیان بە دان و ستاندن و گفتوگۆ چارەسەر بکەن.
- دەبێ ڕێز لە منداڵەکانیان بگرن و نەیان شکێننەوە.
- دەبێ بەشێوەیەکی زانستییانە و پەروەردەییانە سەرەدەری لەگەڵ منداڵەکانیان بکەن.
- دەبێ خۆیان لە هەڵچوون و تووڕەبوونی ئاگرین بپارێزن.

- دەبێ کەشێکی گونجاو لەناو خێزاندا فەراهەم بکەن، بۆ ئەوەی هەموو ئەندامانی خێزان بتوانن پێکەوە هەڵ بکەن.
- دەبێ باوان خۆ لە ستەم و زۆرداری بپارێزن.
- دەبێ باوان خۆ لە نادادپەروەری بپارێزن و بە یەك چاو سەیری هەموو منداڵەکانیان بکەن.

## فەرمانکردن بەسەر منداڵدا لە جیاتی گفتوگۆ

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە فەرمانکردن بەسەر منداڵەکانیاندا، لە جیاتی دان وستاندن و گفتوگۆ، مخابن سەرەدەری هەندێ دایك و باوك لەگەڵ منداڵەکانیان وەك سەرەدەری ئەفسەرەکانە لەگەڵ سەربازەکان، واتە بەس فەرمانیان بەسەردا دەکەن و هیچ ڕێز و بەهایەك بۆ لایەنی بەرامبەر دانانێن، ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- ئەو جۆرە دایك و باوکانە هەر لە منداڵییەوە لەسەر ئەم کارە ڕاهاتوون و گەورەکان بەم شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵدا کردوون.
- بەهۆی نەزانین و ئاشنانەبوون بە شێوازە دروستەکانی پەروەردە و فێرکردن.
- خۆسەپاندن و خۆدەرخستن، بەتایبەتی لە ناو خەڵکدا.
- ڕێزنەگرتن لە مافی بەرامبەر.
- ئاشنانەبوون بە مافەکانی منداڵ.

- نەخوێندەواری و نزمی ئاستی زانستی دایك و باوك.

ئەڵبەتە فەرمانكردن بەسەر منداڵدا و پەنا نەبردن بۆ دان وستاندن و گفتوگۆ لەكاتی سەرهەڵدانی كێشە و ئاریشەكاندا، زیانێكی زۆر بە منداڵ دەگەیەنێت و ژیانی بەرەو هەڵدێر دەبات و چارەنووسی دەخاتە مەترسییەوە، گرنگترین ئەو زیانانەش ئەمانەن:

- منداڵ تووشی زەلیلی دەبێ و هەست بە خۆكەمزانین دەكات.
- بڕوای بە خۆی نامێنێ و نەفسییەتی دەشكێت.
- ناتوانێ پشت بە توانا و بەهرەكانی خۆی ببەستێت و لەسەر قاچەكانی خۆی بوەستێت.
- ڕقی لە دایك و باوك و كەسانی دیكە دەبێتەوە.
- هەستی تۆڵەكردنەوە لای منداڵ چەكەرە دەكات.
- دەبێتە منداڵێكی ورەبەزیو و شكستخواردوو و ناسەركەوتوو.
- دەبێتە كەسێكی خۆسەپێن و تاكڕەو.
- لە كاتی سەرهەڵدانی كێشەكان، هەمیشە لە جیاتی دان و ستاندن، پەنا بۆ فەرمانكردن و دەمكوتكردن دەبات.
- لە ژیاندا سەركەوتوو نابێت.

## چارەسەركردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی دایك و باوك لەسەر بناغەیەكی ڕاست و دروست پەیوەندییەكانی خۆیان لەگەڵ منداڵەكانیان ڕێك بخەن و هاوسەنگی لە نێوان ئەرك و مافەكانیان بپارێزن، دەبێ ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بكەن:

- پێویستە دایك و باوك خۆیان لە فەرمان كردن بپارێزن.
- دەبێ بۆ چارەسەركردنی هەر كێشەیەك، پەنا بۆ دان و ستاندن و گفتوگۆ ببەن.
- دەبێ خۆیان لە ناوزڕاندن و تەرقیكردنەوەی منداڵەكانیان بپارێزن.
- دەبێ خۆیان لە تاكڕەوی و خۆسەپاندن بپارێزن.
- دەبێ ڕێز لە مافی منداڵەكانیان بگرن.
- دەبێ پردێكی پتەوی سۆز و خۆشەویستی لە نێوان خۆیان و منداڵ دروست بكەن و وەك دوو دۆستی گیانی بە گیانی بن.
- دەبێ خۆیان لەهەر جۆرە توندوتیژییەك بپارێزن.
- دەبێ خۆیان لە تەلقێندانی منداڵەكانیان بەدووربگرن.

## خۆسەپاندن و تاکڕەوی

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە زۆرێک لە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لەخۆسەپاندن و تاکڕەوی ئەوان لە ماڵەوە، بە واتایەکی دیکە، هەندێ باوان لە ماڵەوە وەك دیکتاتۆر ڕەفتار دەکەن و کەسانی خۆسەپێنەر و تاکڕەون، واتە هەموو جۆرە دەسەڵاتێك قۆرغ دەکەن و هەم گەزیان پێیە، هەمیش مقەس!!!

ئەمەشە بۆ چەندین هۆکار دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- زۆربەی ئەو دایك و باوکانەی کە دەبنە دیکتاتۆر و خۆسەپێەر، لە ژینگەیەکی جەور و ستەم و دیکتاتۆریەتدا گەورە بوون و لە بنەماکانی هاوبەشی و بەرپرسیارەتی و دادپەروەری و ئازادی و لێبوردەیی بێبەش بوون.
- هەبوونی دەروونێکی پڕ ڕق و قین و دڵڕەقی.
- هەبوونی حەزی خۆسەپاندن و چەوساندنەوە.
- هەبوونی حەزی خۆدەرخستن.
- نەزانین و نارۆشنبیری.
- نزمی ئاستی زانستی.
- خراپی ڕەوشی ئابووری.
- هەبوونی کێشەی خێزانی و کۆمەڵایەتی.

هەڵبەتە خۆسەپاندن و تاکڕەوی دایك و باوك، زیانێکی زۆر بە گەشی منداڵ و خانەوادە و کۆمەڵگە دەگەیەنێت، گرنگترین ئەو زیانانەش ئەمانەن:

- منداڵ هەست بە بێبەشی و جەور و ستەم دەکات.
- منداڵ لە سۆز و میهرەبانی باوانی بێبەش دەبێت.
- منداڵ کە گەورەبوو، هەمان ڕەفتاری دایک و باوکی بەرامبەر بە منداڵەکانی دووبارە دەکاتەوە و چاو لە وان دەکات.
- ڕق و قینە لە دڵی منداڵدا دروست دەبێت.
- بنەمای ڕاوێژ و دادپەروەری پێشێل دەکرێت.
- ئەندامانی خێزان لەسەر بنەمای ڕێزگرتن لە یەکتری سەرەدەری لەگەڵ یەکتری ناکەن.
- منداڵ ناتوانێ پشت بە تواناکانی خۆی ببەستێت.
- منداڵ بڕوا و متمانەی بە دایك و باوکی نامێنێ.
- منداڵ کە گەورەبوو، بیر لە تۆڵەکردنەوە دەکاتەوە.
- منداڵ لە ئایندەدا سەرکەوتوو نابێت.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە:

بۆ ئەوەی دایك و باوك نەکەونە داو و هەڵە و تەڵەی خۆسەپاندن و تاکڕەوی و بەشێوەیەکی دادپەروەرانە سەردەری لەگەڵ منداڵەکانیان بکەن، دەبێ ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەن:

- خۆیان لە توندوتیژی و زەبر و زەنگ بپارێزن.
- بەشێوەیەکی دادپەروەرانە سەرەدەری لەگەڵ گشت منداڵەکانیان بکەن و جیاکاری لە نێوانیاندا نەکەن.
- دەبێ باوان ئاشنا بن بە بنەماکانی زانستی و پەروەردەیی.
- دەبێ باوان خۆیان بەدوور بگرن لە تۆڵەسەندنەوە و ڕق و قین.

- دەبێ کارەکان بە پرس و ڕاوێژ ئەنجام بدەن.
- دەبێ هەست بە بەرپرسیارەتی بکەن.
- دەبێ دەسەڵاتەکان دابەش بکەن و بەپێی توانا و تەمەن دەسەڵات بە منداڵەکانیان ببەخشن.
- دەبێ مافی منداڵەکان بپارێزن، بەتایبەتی مافی ئازادی و مافی ڕادەربڕین و مافی بەرگری لەخۆکردن و مافی وەڵامدانەوە و و مافی داواکاری و مافی خوێندن و مافی ژیان بە شێوەیەکی شکۆمەندانە و دوور لە هەموو جۆرە جەور و چەوساندنەوەیەك.

## پارە هەڵڕشتن بەسەر منداڵدا

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە پارە هەڵڕشتن بەسەر منداڵدا.

ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- دەوڵەمەندی و خۆشگوزەرانی دایك و باوك
- بەنازپەروەردەکردنی منداڵ لە لایەن دایك و باوکییەوە.
- ئاشنانەبوونی دایك و باوك بە شێوازە زانستی و پەروەردەییەکان.
- خۆدەرخستن و خۆهەڵکێشانی دایك و باوك لەناو خەڵك و خزم و کەسەکانیاندا.
- نەبوونی پلان و بەرنامەی پێشوەخت.
- نزمی ئاستی زانستی دایك و باوك.
- نەبوونی ئامانج و مەبەست.
- بیرنەکردنەوە لە ئایندەی ئەو کارە هەڵەیە.
- ئاشنانەبوون بە شێوازە پەروەردەیی و زانستی و پەروەردەیەکان.

بێگومان پارە هەڵڕشتن بەسەر منداڵدا، زیانێکی زۆر بە خودی منداڵ و دایك و باوك دەگەیەنێت و زۆرجار بە کارەسات کۆتایی دێت!گرنگترین ئەو زیانانەش ئەمانەن:

- منداڵ ناتوانێ پشت بەخۆی ببەستێت و هەمیشە پشت بە دایك و باوکی و کەسانی دیکە دەبەستێت.
- لە دۆخە دژوارەکاندا ناتوانێ کەری خۆی لە قوڕێ دەربێنێت!
- کەسێکی تەمبەڵ و تەوەزەل دەردەچێت.

- هەمیشە چاوی لە دەستی ئەم و ئەو دەبێت.
- بەنازپەروەردە دەبێ.
- سوود لە توانا و بەهرەکانی خۆی وەرناگرێت.
- متمانەی بەخۆی نابێت.
- بەرگەی نەخۆشی و ناخۆشییەکانی ژیان ناگرێ و لە ژیاندا سەرکەوتوو نابێت.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە:

بۆ ئەوەی دایک و باوک نەبن بەهۆکارێک بۆ لاساری و بەلاڕێدابردنی منداڵەکانیان، دەبێ ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بهاوێژن:

- دەبێ بە ئەندازە پارە بە منداڵەکانیان بدەن، کە نە شیش بسووتێت نە کەباب.
- دەبێ زیاد لە پێویست ناز بە منداڵ نەدەن.
- دەبێ هەر لە منداڵییەوە منداڵ لەسەر چەمکی بەرپرسیارەتی ڕابێنن.
- دەبێ خۆیان لە زێدەخەرجی و دەستبڵاوی بەدوور بگرن.
- دەبێ بەپێی توانا و تەمەنی منداڵ، ئەرک و بەرپرسیارەتیی پێبدرێ.
- دەبێ خۆیان لە چاولێکەری و لاساییکردنەوەی کوێرانە بەدوور بگرن.
- نابێ گشت داواکاریەکانی منداڵ جێبەجێ بکەن، بەتایبەتی داواکارییە ناپەسەندەکانی.

- دەبێ خۆیان ئاشنا بکەن بە تیۆرە زانستی و پەروەردەییەکان.
- دەبێ لە خەرجکردنی پارەدا، چاودێری منداڵ بکرێ و ڕێنمایی بکرێت بۆ ئەوەی بەلاڕێدا نەڕوات و لاسایی کەسانی دیکە نەکاتەوە و زیاد لە حەد پارە خەرج نەکات.
- دەبێ دۆست و ڕەفیقی چاک بۆ منداڵەکانیان بدۆزنەوە و لە هاوڕێیانی خراپ دووریخەنەوە.
- دەبێ منداڵ لەسەر ئەو بنەمایە پەروەردە بکرێت کە ئەوەی مافی هەبێت ئەرکیشی لە سەرە.

## لاساری دایک و باوک

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە لاساربوونیان و لادان لە بەها زانستی و پەروەردەییەکان، واتە خودی ئەو دایک و باوکە لاسارانە و بەشێوەیەکی ناتەندروست و ناپەروەردەیی سەرەدەری لەگەڵ یەکتری و منداڵەکانیان دەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا چاوەڕوانی ئەوە لە منداڵەکانیان دەکەن کە نموونەیەکی جوانتر لەهی خۆیان پێشکەش بە کۆمەڵگە بکەن، واتە بەخۆیان دڕکن، بەڵام چاوەڕوانی ئەوە دەکەن منداڵەکانیان گوڵ بن، ئەمەش پێچەوانەی عەقڵ و لۆژیکە، کورد وتەنی گیا لەسەر بنکی خۆی دەڕوێت، هەروەها پێشینان فەرموویانە چی بچێنیت ئەوە دەدوریتەوە.

ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- لادان لە بەها پەروەردەیی و زانستییەکان.
- بەهەڵە تێگەیشتن لە فەلسەفە و چەمکی پەروەردە.
- دوورکەوتنەوە لە بەها ئەخلاقی و کۆمەڵایەتییەکان.
- خۆ بەزلزانین و خۆهەڵکێشان و لەخۆبایی بوون.
- هەستنەکردن بە بەرپرسیارەتی.
- کاریگەری ڕاگەیاندن و تەکنەلۆجیا لەسەر دایك و باوك.
- کاریگەری کەلتوور و داب و نەریتی باوی کۆمەڵگە لەسەر دایك و باوك.
- گەورەبوونی دایك و باوك لە ناو ژینگەیەکی تەندروست و نەخۆشدا.

ئەڵبەتە لاساری دایك و باوك هەر تەنیا زیان بەخۆیان ناگەیەنێت، بەڵکو مەترسی لەسەر ئایندەی منداڵیش دروست دەکات، کە گرنگترین ئەو زیانانەش ئەمانەن:

- دایك و باوك دەبن بە چاوساغێکی خراپ بۆ منداڵەکانیان و منداڵەکانیان چاو لەوان دەکەن.
- دەبنە پەروەردەکاری ناتەندروست و ناپەروەردەیی.
- دەبن بەهۆکارێك بۆ بەلاڕێداچوونی منداڵەکانیان.
- کاریگەرییەکی خراپ لەسەر کۆمەڵگە جێدێڵێت.
- منداڵ لە بەرپرسیارەتی ڕادەکات.
- منداڵ دووچاری تاوان و لادان دەبێت.
- هاوڕێی خراپ هەڵدەبژێرێت.
- منداڵ لە ژیانیدا دووچاری زۆر کێشە دەبێت و سەرکەوتوو نابێت.

**چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە:**

بۆ ئەوەی دایکان و باوکان نەبن بە هۆکارێک بۆ لاساری منداڵەکانیان، دەبێ ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بهاوێژن:

- دەبێ خۆیان لە لاساری و بەلارێداچوون بپارێزن.
- دەبێ نموونەیەکی جوان بن لە ڕەوشتبەرزی و خۆشمەشرەبی.
- دەبێ ئەوەی بە تیۆر دەبێژن، بە کردار بیبێژن!
- دەبێ ئاشنا بن بە بنەما زانستی و پەروەردەییەکان.
- دەبێ هەست بە بەرپرسیارەتی بکەن.
- دەبێ هەڵەکانی خۆیان ڕاستکەنەوە و هەڵە بە هەڵە چارەسەر نەکەن.
- پێویستە ڕێز لە مافەکانی منداڵ بگرن و لە کردارەکانیاندا بەرجەستە بکەن.

## دەستوەردان لە کارە ورد و درشتەکانی منداڵ

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە دەستوەردان لە کارە ورد و درشتەکانی منداڵ، واتە منداڵ لەناو دەستیاندا وەك ڕۆبۆتێك وایە، بە کەیفی خۆیان دەیجووڵێنن و فەرمانی بەسەردا دەکەن و پێی دەڵێن: ئەمە بکرە و ئەمە نەکرە، ئەم کارە بکە و ئەم کارە مەکە، ئەمە بخۆ و ئەمە مەخۆ، ئەم یارییە بکە و ئەم یارییە مەکە و....تاد.

هەموو ئەم فەرمان و دەستوەردانانەش وا دەکات کە منداڵ کەسایەتی و ئیرادەی خۆی لە دەست بدات و بڕوا و متمانەی بەخۆی نەمێنێت و ڕووبەڕووی کێشەی مەزن ببێتەوە، ئەڵبەتە هەڵسوکەوتی ئەم جۆرە دایك و باوکانەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- لەپێناو پاراستنی منداڵ لە زیانە جەستەیی و ماددییەکان.
- بۆ کۆنترۆڵکردنی منداڵ.
- لاسایی کردنەوەی خەڵکی دیکە.
- بە چاوێکی کەم سەیرکردنی منداڵ.
- گەمژەیی و کاڵفامی.
- هەبوونی حەزی خۆسەپاندن و تاکڕەوی لە ناخی دایك و باوکدا.
- نەزانین و ناشارەزایی.
- دوورکەوتنەوە لە بەها پەروەردەییەکان.
- ڕێز و بەها نەدانان بۆ منداڵ.
- متمانە و باوەڕنەبوون بە منداڵ.

- چاولێکەری و لاساییکردنەوە.
- نزمی ئاستی زانستی دایك و باوك.

لە ڕاستیدا ئەرکی دایك و باوکە هەمیشە چاودێرین بەسەر منداڵەکانیانەوە و لە کاتی پێویستدا ڕێنمایی و ئامۆژگارییان بکەن، بەڵام نەگاتە ئاستێك کە منداڵ هیچ دەسەڵات و حەز و هەڵبژاردەیەکی نەمێنێ و ببێتە ئامێر و ڕۆبۆتێك بەدەستیانەوە، چونکە لەو حاڵەتەدا زیانێکی زۆر بە خودی قوتابی و کۆمەڵگەش دەگەیەنێت، کە لەم چەند خاڵەدا چڕ دەکەینەوە:

- منداڵ متمانە و بڕوای بەخۆی نامێنێ.
- کەسایەتییەکی لاوازی دەبێت .
- منداڵ کە گەورە بوو، فێرە ژیانی بکە و نەکە دەبێ و هەمان ڕێچکەی دایك و باوکی دەگرێتەبەر.
- بە شێوەیەکی ناتەندروست پەروەردە دەبێت.
- ڕقی لە دایك و باوکی دەبێتەوە.
- دووچاری نیگەرانی و دڵەڕاوکێ دەبێت.
- تووشی دوورەپەرێزی و گۆشەگیری دەبێت.
- کۆمەڵگە لە بەهرە و تواناکانی بێبەش دەبێت.
- منداڵ لە ڕاپەڕاندنی ئەرك و کارەکانی و لە ژیانی خۆیدا سەرکەوتوو نابێت.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە:

بۆ ئەوەی دایکان و باوکان چیتر دەست بۆ کارە ورد و درشتەکانی منداڵەکانیان نەبەن و زیانی پێنەگەیەنن، دەبێ ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بهاوێژن:

- دەبێ دایك و باوك مەودایەك بۆ ئازادی منداڵ جێبێڵن.
- دەبێ دەست لە کارە ورد و درشتەکانی منداڵ وەرنەدەن.
- دەبێ لە کاتی پێویست، منداڵ ئامۆژگاری و ڕێنمایی بکرێت.
- دەبێ دایك و باوك ئاشنا بن بە بنەما زانستی و پەروەردەیەکان.
- نابێ هەموو بڕیارێك بەسەر منداڵەکانیاندا بسەپێنن.
- دەبێ زوو بڕیار نەدەن.
- دەبێ دایك و باوك بەهەماهەنگی و یەك هەڵوێستی و بە پرس و ڕاوێژ کارەکانیان ئەنجام بدەن.
- دەبێ لەکاتی پێویستدا پرس و ڕا بە کەسانی پسپۆر و شارەزا بکەن.
- دەبێ ئاشنا بن بە قۆناغەکانی گەشەکردنی منداڵ و شێوازی سەرەدەریکردن لەگەڵ منداڵدا.

## ڕاهێنانی منداڵ لەسەر جوێندان

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە فێرکردن و ڕاهێنانی منداڵ لەسەر جوێندان، واتە هەر لە سەرەتای هاتنە قسەوە، دایک یان باوک یان هەردووکیان هەوڵدەدەن منداڵ فێرە قسەی ناشیرین و جوێندان بکەن، ئەم کارەش بۆ دوو هۆکار دەگەڕێتەوە:

١. یان خودی دایك و باوکەکان زمانشڕ و جوێندەرن و لەو ڕێگەیەوە منداڵەکانیان فێرە جوێندان و زمانشڕی دەکەن.

٢. یاخود بە ئەنقەست منداڵەکانیان لەسەر جوێندان ڕادێنن و فێرە زمانشڕی و قسەی ناشیرین دەکەن، بۆیە ئەوەی گاڵتەیان لەگەڵدا بکەن، بەتایبەتی لە سێ ساڵی یەکەمی تەمەنیاندا، چونکە لەو تەمەنەدا قسەیان خۆشە!

ئەڵبەتە ئەم کارە کارێکی زۆر ناڕاست و ناپەروەردەییە و دەبێتە هۆی ئەوەی منداڵەکە فێرە قسەی شڕ و جوێن و قسەی ناشیرین ببێت و سەرئێشە بۆ خۆی و دایك و باوکی و کۆمەڵگەش دروست بکات.

گرنگترین ئەو کێشانەش کە ڕووبەڕووی منداڵەکە دەبنەوە ئەمانەن:

- منداڵ کەسێکی پاك و بێگەردە، بەڵام لە دایك و باوکییەوە فێرە زمانێکی زبر دەبێت و هەستی خەڵك بریندار دەکات.
- منداڵ کە فێرە جوێندان بوو، دواتر بەئەستەم دەتوانێ وازی لێ بێنێت چونکە وتراوە " ئەو شتەی مرۆڤ لە منداڵییەوە فێر دەبێت وەك ئەو نەخشەیە وایە کە لەسەر بەرد دروست دەکرێت".

- منداڵ بەو زمانە زبر و شڕە تووشی زۆر کێشە دەبێت، بەتایبەتی لە ماڵەوە و لە کۆڵان و لەگەڵ هاوڕێیانیدا و لە گۆڕەپانی یاری و لە قوتابخانە و بازاڕ و کۆمەڵگە و...تاد.
- منداڵ فێرە بەدڕەوشتی دەبێت.
- منداڵ دووچاری گۆشەگیری و دوورەپەرێزی دەبێت.
- کەس ئەو جۆرە منداڵەی خۆش ناوێت.
- بە پلەی یەکەم منداڵ باجەکەی دەدات، بەتایبەتی لە ئایندەدا.
- منداڵ بەهۆی جوێندانەوە، ڕووبەڕووی لێدان و توندوتیژی دەبێتەوە و ئازار و ئەشکەنجە دەدرێت.
- منداڵ لە ژیانی خۆیدا سەرکەوتوو نابێت.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە:

بۆ ئەوەی منداڵ فێرە جوێن و قسەی ناشیرین و شڕ نەبێت و هەستی خەڵك بریندار نەکات، پێویستە دایکان و باوکان لە خۆیانەوە دەستپێبکەن و ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بهاوێژن:

- نابێ دایك و باوکەکان جوێندەر و زمانشڕ بن.
- نابێ منداڵەکان لەسەر جوێن و زمانشڕی ڕابهێنن.
- دەبێ زیان و دەرەنجامە خراپەکانی زمانی شڕی بزانن.
- دەبێ بیر لە ئایندەی منداڵەکانیان بکەنەوە و بزانن ڕووبەڕووی چ کێشە و ئاریشەیەك دەبنەوە.
- دەبێ هۆکاری بەختەوەری بن بۆ منداڵەکانیان، نەك بەدبەختی و شەرمەزاری.

- نابێ لەسەر زمانشڕی و جوێندانی منداڵەکانیان، پشتگیری لە منداڵەکانیان بکەن، بەڵکو پێویستە هەڵەکانیان بۆ ڕاستەکەنەوە و تێیانبگەیەنن، کە جوێن و قسەی ناشیرین هۆکارێکە بۆ بریندارکردنی هەستی خەڵك و دروستکردنی کێشە و گرفت بۆ خۆیان و دایك و باوکیان و خەڵکیش، چونکە زۆرجار لەسەر جوێن کێشەیەکی گەروە لەناو کۆمەڵگە بەرپابووە، بەتایبەتی ئەگەر لێبوردەیی نەبێت.

## ڕێزنەگرتن لە ڕا و بۆچوونەکانی منداڵ

ڕێزگرتن لە منداڵ بریتییە لەوەی دایک و باوک بزانن منداڵ مافی قسەکردنی هەیە، مافی ئەوەی هەیە گوزارشت لە ڕا و بۆچوونی خۆی بکات، بەتایبەتی لە قۆناغی فاماندن، منداڵ مافی ئەوەی هەیە بەرگری لەخۆی بکات، منداڵ نابێ لەپێش چاوی خەڵك ڕیسوا بکرێ یان سەرزەنشت بکرێ یان قسەی پێ ببڕێت یان بکرێتە دەرەوە یان لێی بدرێت و قسەی ناشیرینی پێبدرێت و یان گاڵتە بە توانا و بەهرەکانی بکرێت و...تاد.

بێگومان هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە ڕێزنەگرتن لە ڕا و بۆچوونەکانی منداڵ، واتە دایك یان باوك یان هەردووکیان هیچ حسابێك بۆ منداڵ ناکەن، ڕا و بۆچوونەکانی بەهەند وەرناگرن، پێیان وایە منداڵ مافی ئەوەی نییە ڕا و بۆچوونی خۆی دەرببڕێت، بەتایبەتی لە قۆناغی فاماندن، بۆیە منداڵ لە چاوی ئەو جۆرە دایك و باوکانەدا کەسێکی بچووکە، تەنانەت ئەگەر بە تەمەن گەورە و خێزداریش بێت.

ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- هەبوونی هەستی خۆبەگەورە و زلزانین.
- بەکەمزانینی منداڵ.
- بە هەڵە سەرەدەریکردن لەگەڵ چەمکە زانستی و پەروەردەییەکان.
- بەهەڵە بەکارهێنانی پێوەرە پەروەردەییەکان.
- نزمی ئاستی زانستی دایك و باوك.

- چاولێکەری و لاساییکردنەوەی ئەوانی دیکە.
- هەبوونی کاریگەری کولتوور و داب و نەریتە باوەکانی کۆمەڵگە لەسەر خێزان.
- دوورکەوتنەوە لە بەها مرۆڤی و ئایینییەکان.
- ئاشنانەبوون بە چەمکە شارستانی و مرۆڤییەکان.
- هەست نەکردن بە بەرپرسیارەتی.
- هەبوونی کێشەی خێزانی و کەسۆکی.
- نەبوونی دونیابینی و ئایندەبینی.
- خۆدزینەوە لە ئەرك و بەرپرسیارەتی.
- ئاشنانەبوون بە مافەکانی منداڵ.

ئەڵبەتە ئەگەر دایك و باوك رێز لە منداڵ نەگرن و مافەکانی پێشێل بکەن، دواجار هەم منداڵ، هەمیش دایك و باوك و خێزان و کۆمەڵگەش رووبەرووی کۆمەڵێك کێشەی جیاجیا دەبنەوە، لەوانە:

- منداڵ کە گەورە دەبێ چاو لە دایك و باوکی دەکات و رێز لە کەسانی دیکە ناگرێ.
- دایك و باوك دەبنە نموونەیەکی خراپ بۆ منداڵ و ئەو نەریتە پشتا و پشت و نەوە بۆ نەوە دەگوازرێتەوە.
- منداڵ هەست بە خۆبەکەمزانین دەکات.
- منداڵ بڕوا و متمانەی بەخۆی نابێت و ناتوانێ ببێتە کەسێکی پشتبەخۆبەستوو و لێهاتوو و سەرکەوتوو لە کایەکانی ژیاندا.
- منداڵ لە رێستگە و قۆناغەکانی دیکەی ژیانی دا، ناتوانێ گوزارشت لە بوونی خۆی بکات.

- منداڵ هەست بە چەوساندنەوە و زەلیلی دەکات.
- منداڵ لە مافی قسەکردن و گوزراشتکردن لە ڕا و بۆچوونەکانی خۆی بێبەش دەبێت.
- منداڵ دووچاری نیگەرانی دەبێت، هەندێ جاریش دەگاتە ئاستی خەمۆکی.
- منداڵ هەست بە شەرمنی دەکات و لەکاتی قسەکردندا تەریق دەبێتەوە.
- لە ڕووی دەروونییەوە منداڵ تێکدەشکێت و کەسایەتییەکەی لەکەدار دەبێت.
- منداڵ لە ژیانی خۆیدا سەرکەوتوو نابێت.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

بۆ ئەوەی دایکان و باوکان بەشێوەیەکی تەندروست سەرەدەری لەگەڵ منداڵەکانیان بکەن و منداڵەکانیان هەست بەوە بکەن کە ڕێزیان لێ دەگیرێت، دەبێ ئەم خاڵانەی خوارەوە لەبەرچاو بگرن:

- دەبێ دایک و باوک پێش هەموو کەسێك ڕێز لە یەکتری بگرن و ڕا و بۆچوونی یەکتری بەهەند وەربگرن، بەتایبەتی لە پێش چاوی منداڵەکانیان، نابێ یەکتری بشکێننەوە، یان گاڵتە بەبۆچوونی یەکتری بکەن، یان بە چاوێکی سووك سەیری بۆچوونی یەکتری بکەن.
- نابێ دایك و باوك بێ ڕێزی بەرامبەر بە منداڵەکانیان بکەن، جا چ بە کردار بێت، یاخود بە گوفتار.

- دەبێ منداڵەکانیان لەسەر چەمکی ڕێزگرتن لە بەرامبەر ڕابهێنن.
- دەبێ ڕێزگرتن لە منداڵ، لە هەڵسوکەوت و کردار و ڕەفتار و گوفتاری دایکان و باوکان ڕەنگبداتەوە، چونکە دایك و باوك وەك ئاوێنە وان بۆ منداڵەکانیان، تاکو چاوی لێ بکەن و ببن بە پێشەنگی چاك بۆیان و خۆیان تێدا ببیننەوە.
- دەبێ ڕێزگرتن لە ناخەوە هەڵقوڵابێت و وەك کاڵایەکی ساختە نەکەنە بەر باڵای خۆیان و منداڵەکانیان.
- دەبێ چاو لە نموونەی باڵا بکەن لەناو کۆمەڵگەدا و، خۆیان لە لاساییکردنەوەی کوێرانە بپارێزن.
- ئەگەر جارێك لە جاران ڕا و بۆچوونی منداڵ بە هەند وەرنەگیرا،یاخود نادیدەگیرا، دەبێ هۆکارەکەی بۆ شیبکرێتەوە، تا هەست بەوە نەکات کە فەرامۆش کراوە.
- دەبێ دایك و باوك،گەشە بە توانا زەینی و هزری و زانستی و جەستەیی و دەروونییەکانی منداڵ بدەن، تاکو لە چاولێکەری و چەقبەستوویی دوورکەوێتەوە و بەرەو داهێنان هەنگاو بنێت و ببێتە کەسێکە ئایندەساز.

## قسەپێبڕینی منداڵ

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە قسەپێبڕینی منداڵ لەکاتی ئاخاوتنندا، واتە هەندێ دایک و باوک ڕێگە بە منداڵەکانیان نادەن قسە بکەن، یا لە میانەی قسەکردندا، قسەیان پێ دەبڕن و کڕ و بێدەنگیان دەکەن، ئەمەش کارێکی ناپەروەردەیی و ناتەندروستە، هۆکارەکەیشی بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە دەگەڕێتەوە:

- لاوازی ئاستی زانستی دایک و باوک.
- ئاشنانەبوونیان بە چەمکە زانستی و پەروەردەیەکان.
- بەکارهێنانی توندوتیژی.
- بێ ئارامی لە کاتی سەرەدەریکردنیاندا لەگەڵ منداڵەکانیان.
- خۆدزینەوە لە بەرپرسیارەتی.
- زاڵبوونی هەستی خۆسەپاندن لە ناخیاندا.
- هەبوونی هەستی تۆڵەسەندنەوە.
- ئاشنانەبوون بە مافەکانی منداڵ و چەمکی مرۆڤدۆستی و مرۆڤپەروەری.
- هەبوونی بگرە و بەردە و کێشەی خێزانی.

ئەڵبەتە ئەگەر دایک و باوک هەمیشە ڕێگربن لە قسەکردنی منداڵ و بەردەوام قسەی پێ ببڕن، بەتایبەتی لەناو دۆست و هاوڕێ و خزم و کەسەکانیدا، ئەو منداڵە لە ژیانی خۆیدا ڕووبەڕووی کۆمەڵێك کێشەی ئاڵۆز دەبێتەوە، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

- هەست بە ستەم و ژێردەستەیی دەکات.

- ناتوانێ گوزارشت لە ناخی خۆی بکات.
- هەمیشە مافی پێشێل دەکرێت.
- ڕقی لە دایك و باوکی دەبێتەوە.
- کەسێکی شەرمنی لێ دەردەچێت.
- مرۆڤێکی گۆشەگیر و دوورەپەرێز دەبێت.
- ناتوانێ پشت بە تواناکانی خۆی ببەستێت.
- لە ژیانی خۆیدا سەرکەوتوو نابێت.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە:

بۆ ئەوەی دایکان و باوکان بەشێوەیەکی پەروەردەیانە سەرەدەری لەگەڵ منداڵ بکەن و خۆیان بەدووربگرن لە قسە پێ برینی منداڵ و دەمکوتکردنی، دەبێ ئەم خاڵانەی خوارەوە لەبەرچاو بگرن:

- دەبێ دایك و باوکەکان خۆ بەدوور بگرن لە قسە پێبڕینی منداڵ.
- دەبێ ڕێز لە مافی دەربڕین(ئاخاوتن) بگرن، تەنانەت ئەگەر ئەو کەسە منداڵیش بێت.
- دەبێ ڕێز لە شکۆ و کەسایەتی منداڵ بگرن.
- دەبێ خۆیان بەدووربگرن لە شکاندنەوە و تەرقیکردنەوەی منداڵ، بەتایبەتی لە پێش چاوی ئەوانی دیکە.
- دەبێ منداڵ لەسەر ئەوە ڕابهێنن کە بە نۆرە قسە بکات و لەکات و شوێنی خۆیدا بێتەگۆ.
- دەبێ منداڵ لەسەر ئەوە ڕام بکرێت کە مافی ئەوانی دیکە پێشێل نەکات بەتایبەتی لەکاتی قسەکردندا.

- دەبێ دایك و باوك بزانن كە قسەكردن ئادابی تایبەت بەخۆی هەیە و دەبێ ئەو ئادابانە لەبەرچاو بگیرێن، وەك قسەنەبڕین، بەنۆرە قسەكردن، قسەلەقسەنەدان، ڕوو وەرنەگێڕان لە كاتی قسەكردن و بە چاكی گوێگرتن و گوێ شلكردن...تاد.
- فراوانكردنی مەودای ئازادی دەربڕین بۆ گشت ئەندامانی خێزان، بە منداڵانیشەوە.

## دووڕوویی دایک و باوک لەگەڵ منداڵ

هەڵەیەكی دیكە لەو هەڵە باوانەی كە هەندێ لە دایكان و باوكان دەرهەق بە منداڵەكانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە دووڕوویی دایك و باوك لەگەڵ منداڵ، واتە، هەندێ دایك و باوك لە كاروكردار و گوفتاریانـدا دووڕوون و بەدوو ڕووی جیاواز سەرەدەری لەگەڵ منداڵ دەكەن، بۆ نموونە: دایك منداڵی خۆی لەگەڵ خۆی دەباتە بازاڕ و لە پێش چاوی منداڵەكەی بە دزییەوە شتێك لە دوكانی وردەواڵە فرۆشەكە هەڵدەگرێ و دەیخاتە جانتاكەیەوە! كەچی لە ماڵەوە ئامۆژگاری منداڵی دەكات كەوا دزی نەكات و دەست بۆ كەلوپەلەكانی هاوڕێیانی نەبات!! یاخود باوك لە پێش چاوی منداڵەكەی جگەرە دەكێشێ، كەچی ئامۆژگاری كوڕی دەكات و پێی دەڵێ كوڕم جگەرە مەخۆ! چونكە پیسە و زیانی هەیە بۆ تەندروستی جەستەت!!

هەبوونی ئەم جۆرە ڕەفتارە بۆ ئەم هۆكارانە دەگەڕێتەوە:

- ناشنانەبوونی دایك و باوك بە بنەما زانستی و پەروەردەییەكان.
- درك نەكردنی دایك و باوك بە گرنگی پەروەردەكردنی منداڵ.
- دووركەوتنەوە و پابەندنەبوون بە بنەما ڕەوشتی و ئایینییەكان.
- هەست نەكردن بە بەرپرسیارەتی و خۆدزینەوە لە ئەرك و بەرپرسیارەتی.
- هەست نەكردن بە مەترسیی ئەم كارە.
- هەبوونی پەروەردەیەكی سەقەت و ناتەندروست.

بێگومان هەر كاتێ دایك یان باوك یان هەردووكیان دووڕوو بوون لەگەڵ منداڵەكانیان و بەدوو شێوازی هاودژ و پێچەوانە مامەڵە و سەرەدەرییان لەگەڵ منداڵەكانیان كرد، منداڵەكانیان ڕووبەڕووی كۆمەڵێك مەترسیی جددی دەبنەوە، كە گرنگترینیان ئەمانەن:

- فێرە درۆ و دووڕوویی دەبن و لە ژیانیاندا ڕەنگدەداتەوە.
- پەنا بۆ كاری ناشیاو و نابەجێ دەبەن و یاسا پێشێل دەكەن.
- بڕوا و متمانەیان بە دایك و باوكیان و كەسانی دیكە نامێنێ.
- لە بەها ڕەوشتی و ئایینییەكان دووردەكەونەوە.
- ڕووبەڕووی كێشە و ئاستەنگەكان دەبێتەوە لەگەڵ خەڵك.
- لە چاوی خەڵكدا سووك دەبێ و ڕێز و حورمەتی خۆی لەدەست دەدات.
- دووربەرێز و گۆشەگیر دەبێت.
- لە ژیانیدا سەركەوتوو نابێت.

**چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە:**

بۆ ئەوەی دایکان و باوکان پردی متمانە لە نێوان خۆیان و منداڵەکانیان دروست بکەن و نموونەیەکی جوان بن لە ژیانی ڕۆژانەدا، دەبێ ئەم خاڵانەی خوارەوە لەبەرچاو بگرن:

- پێویستە دایک و باوک لە کاروکردارییاندا، لە ڕەفتار و هەڵسوکەوتیاندا، لە گوفتار و ئاخاوتنیاندا، ڕاستگۆ و یەکڕوو بن لەگەڵ منداڵەکانیاندا و بە دووڕووی جیاواز، سەرەدەری لەگەڵ منداڵەکانیان نەکەن.
- پێش ئەوەی دایک و باوک، منداڵەکانیان ناچار بەهەر کار و کردارێك بکەن، دەبێ سەرەتا لە خۆیانەوە دەستپێبکەن، واتە بە کردەوە ئەو بابەتە بۆ منداڵەکانیان بسەلمێنن.
- نابێ ئەو هەستەیان لا دروست بێت کەوا منداڵەکانیان درك بە بابەت و مەسەلەکان ناکەن، یاخود وابزانن دەتوانن فێڵ لە منداڵەکانیان بکەن، مرۆڤ دەتوانێ جارێك فێڵ لە کەسانی دیکە بکات، بەڵام هەرگیز ناتوانێت بۆ هەمیشە فێڵیان لێبکات.

بەپێچەوانەوە، هەندێ جار منداڵەکان زۆر لە دایبابەکانیان بیرتیژترن و هەر کارێکی هەڵە و ناشیاوی دایك و باوك کە بەچاوی خۆیان ببینن بەئاسانی لە بیری ناکەن و لەناو یادگەکەیاندا تۆمار دەبێت!!

- دەبێ بزانن پەروەردەکردنی منداڵی دەستپاك و زمانپاك و داماپاك و ناخپاك و چاوپاك، پێویستی بە کەسانی دەستپاك و زمانپاك و

دامانپاك و ناخپاك و چاوپاك هەیە، بۆیە دەبێ ئەم جۆرە سیفەتانە لە کەسایەتی ئەواندا ڕەنگبداتەوە.

- دەبێ دایك و باوك ئاشنابن بە قۆناغەکانی گەشەکردنی منداڵ.
- دەبێ دایك و باوك ئاشنابن بە بنەما زانستی و پەروەردەیەکان.
- لە کاتی ڕوودانی هەر هەڵەیەکدا، دەبێ دانی پێدابنێنن و هەڵەی خۆیان ڕاستکەنەوە.
- دەبێ بەرپرسانە و هەستیارانە سەرەدەری لەگەڵ منداڵەکانیان بکەن.
- دەبێ پەروەردەکردنی منداڵەکانیان بەشێوەیەکی زانستییانە و پەروەردەیانە بێت و پەروەردە لای ئەوان ببێتە ستراتیژ، نەك تاکتیك.

## گەورەکردنی شتەکان زیاد لە ئەندازەی خۆی

هەڵەیەکی دیکە لەو هەڵە باوانەی کە هەندێ لە دایکان و باوکان دەرهەق بە منداڵەکانیان ئەنجامی دەدەن، بریتییە لە گەورەکردنی شتەکان، زیاد لە ئەندازەی خۆی، واتە مێش دەکەن بە گامێش و نیسك دەکەن بە گیسك و شتەکان لە قەبارەی خۆیان گەورەتر دەکەن.

بۆ نموونە: منداڵ لە وانەیەك، نمرەیەکی کەم بەدەستدەهێنێت، جا لەبری ئەوەی دایك و باوکی منداڵەکە هانی بدەن و باری سووك کەن و پێی بڵێن ڕۆڵە: خەم مەخۆ، هیچ نییە، ئەگەر زیاتر سەعی بکەیت و زیاتر خۆت ماندووکەیت، نمرەکەت بەرزدەکەیتەوە، ئێمەش ئەوەی لەدەستمان بێت بۆ تۆ دریغی ناکەین، کەچی دەیکەن بە هەڵڵا و بۆڵە بۆڵ و پێی دەڵێن: تۆ بە کەڵکی قوتابخانە نایەیت، دەمانزانی تۆ کەسێکی فاشیلیت، دەمانزانی هیچ نازانیت، دەمانزانی سەرمان شۆڕدەکەیت و بەدەیان دەمانزانی دیکە ڕیز دەکەن و ورەی منداڵ تا سەر سفر دەڕۆخێنن و قوتابخانە و خوێندن لە پێش چاوی ڕەش دەکەن.

ئەڵبەتە ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

- بڕوا و متمانە بەخۆ نەبوون.
- بە چاوێکی کەم سەیرکردنی منداڵ.
- بۆ سەرنجڕاکێشانی ئەوانی دیکە بەلای خۆیاندا.
- هەستکردن بە خۆکەمزانین.
- خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات.
- ناشنانەبوون بە ماف و ئەرکەکانی منداڵ.

- ئاشنانەبوون بە بنەما زانستی و پەروەردەیەکان.
- نەخوێندەواری و نزمی ئاستی زانستی ئەو جۆرە دایك و باوکانە.
- حەزیانە لەوەیە مێش بکەن بە گامێش و شتەکان لە ئەندازەی خۆیان گەورەتر بکەن.

ئەڵبەتە گەورەکردنی شتەکان زیاد لە ئەندازەی خۆی، زیانێکی زۆر بە خودی منداڵ و خێزان دەگەیەنێت، لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

- سەر لە منداڵ دەشێوێنێ.
- پاڵ بە منداڵەوە دەنێ کەوا درۆ بکات، بۆ ئەوەی خۆی لە کێشەکە ڕزگار بکات.
- منداڵ بە سەقەتی پەروەردە دەبێت.
- منداڵ لاسایی دایك و باوکی دەکاتەوە و کە گەورە بوو هەمان ڕۆڵی ئەوان دەگێڕێت و پێ لەو ئاوە دەخشێنێ، کە ئەوان ڕشتوویانە!
- منداڵ فێرە خۆدزینەوە دەبێت لە ڕاپەڕاندنی کارەکانیدا.
- باری منداڵ قورس دەبێت.
- منداڵ هەمبەر دایك و باوکی ڕقئەستوور دەبێت.
- منداڵ هەست بەبەرپرسیارەتی ناکات و لە ژیانیدا سەرکەوتوو نابێت.

## چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیە

نابێ دایکان و باوکان شتەکان لە قەبارەی خۆیان گەورەتر بکەن، بۆ ئەوەی ورەی منداڵ نەڕووخێ و هەست بە ناکامی و شکست نەکات،

جا بۆ هێنانەدی ئەم مەبەستەش پێویستە ئەم خاڵانەی خوارەوە لەبەرچاو بگرن:

- کێشەکان وەك خۆی وەرگرن، نەك وەك خۆیان دەخوازن.
- دەبێ سنووری هەر کێشەیەك بزانن.
- بەشێك بن لە چارەسەر، بەشێك نەبن لە کێشە.
- درك بە زیانەکانی گەورەترکردنی کێشەکان بکەن.
- خۆیان لە خۆسەپاندن بپارێزن.
- زوو زوو بڕیار نەدەن، تا نەکەونە هەڵە و تەڵەوە.
- خۆیان ئاشنا بکەن بە بنەماکانی پەروەردە و فێرکردنەوە.
- خۆیان لە زێدەبێژی بپارێزن.
- کارێك لە منداڵ داوا بکەن، کە لە توانای ئەو دابێت.
- لە سنووری دەسەڵاتی خۆیان دەرنەچن.
- دەسەڵاتی خۆیان خراپ بەکارنەهێنن.

## سەرچاوە کوردییەکان


١. چۆن سەرکەوتوو دەبیت، دیل کارنگی، وەرگێڕانی سەلام کەریم، بڵاوکراوەی خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوار چرا، چاپی یەکەم.

٢. هێزی سەرکەوتوو، ئۆرایزن نسفوت ماردن، وەرگێڕانی سەباح موڕادی، لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما، چاپی یەکەم، ٢٠٠٩.

٣. مامۆستای باش وسەرکەوتوو کێیە؟ محەمەدساڵح پێندرۆیی (جگەرسۆز)، چاپخانەی رۆژهەلات، چاپی دووەم، ساڵی ٢٠١٠.

٤. کارگێڕی بە چیرۆك، نووسینی عادل شێخانی، چاپی دووەم، ٢٠١٢.

٥. هەنگاو بەرەو سەرکەوتن، نووسینی خالید ئێرتوغرۆڵ، وەرگێڕانی شاگوڵ جەلال، چاپی دووەم ٢٠١٢.

٦. مرۆڤی سەرکەوتوو کێ چۆن؟عدنان محمـودالبزاز و سەروەر حەسەن، لە چاپکراوەکانی خانەی چاپ وپەخشی رێنما، چاپی دووەم، ساڵی ٢٠٠٨.

٧. گەشبینی گرنگترین رێگای بەختەوەری تۆیە، ئەنوەر ئەحمەد مستەفا، چاپخانەی گوڵ، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٧.

٨. سایکۆلۆژیای رێنمایکردنی دەروونی، د.کەریم شەریف قەرەچەتانی، لە زنجیرە بڵاوکراوەکانی گۆڤاری ناسۆی پەروەردەیی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٥.

٩. شەش کتێب لە یەك بەرگدا، د.ئیبراهیم فەقێ، و: تاقانە عمر، چاپەمەنی سایە، ساڵی ٢٠١٠.

١٠. رۆڵی خێزان و قوتابخانە لە پەروەردە و فێرکردنی قوتابیدا، محەمەدساڵح پێندرۆیی (جگەرسۆز)، چاپخانەی رۆژهەلات، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٥.

١١. لێکتێگەیشتن لە ژیانی هاوسەرگیریدا،د. مأمون مبیض، وەرگێڕانی هونەر مولود حسین، چاپخانەی رۆژهەڵات، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٤.

١٢. وتەکانی ژیان، گۆڕین و ئامادەکردنی محەمەد عەبدولڕەحمان زەنگەنە، نارین، چاپی چوارەم، ساڵی ٢٠١٠.

١٣. كێشە ئاكاری و دەروونییەكانی منداڵ، وەرگێڕانی محەمەدساڵح پێندرۆیی (جگەرسۆز)، چاپخانەی رۆژهەلات، چاپی دووەم، ساڵی ٢٠١١.

١٤. ١٠٠١ وانە، ئامادە و كۆكردنەوەی ڕێبین خاڵس، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، ساڵی ٢٠١٤.

١٥. رۆڵی خێزان و قوتابخانە لە نەهێشتنی توندوتیژیدا، محەمەدساڵح پێندرۆیی (جگەرسۆز)، چاپخانەی رۆژهەلات، چاپی یەكەم، ساڵی ٢٠١٢.

١٦. رازی سەركەوتن، نووسینی هادی المدرسی، وەرگێڕانی منیرە رەشۆف واژەیی، لە بڵاوكراوەكانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما، ساڵی٢٠١٣.

١٧. دەروونناسییا زارۆكان، حسین نەجاتی، وەرگێڕانی محەمەدساڵح پێندرۆیی (جگەرسۆز)، چاپخانەی رۆژهەلات، چاپی یەكەم، ساڵی ٢٠٠٣.

١٨. پەیوەندی دناڤبەرا مامۆستای و قوتابیدا، هاییم گینات، وەرگێڕانی محەمەدساڵح پێندرۆیی (جگەرسۆز)، چاپخانەی رۆژهەلات، چاپی یەكەم، ساڵی ٢٠١٥.

١٩. هەراسانكردنی منداڵ لە نێوان ماڵ و قوتابخانەدا، فایەق سەعید، بڵاوكراوەكانی ئاراس، چاپی یەكەم، ساڵی چاپ ٢٠٠٧.

٢٠. گرفتە دەروونییەكان(پێشنیار و هەواڵ بۆ چارسەر)تەها محەمەد ئەمین، بڵاوكراوەی ئاراس، چاپی یەكەم، ساڵی چاپ ٢٠١٢.

٢١. دیاردە توندوتیژییەكان لای منداڵان و تازە پێگەیشتوان، ڕێگاكانی ڕووبەڕووبوونەوە،د. باری ماك ئامارا و فرانسیس مەك ئامارا، وەرگێڕانی بۆ كوردی محەمەد هەڵەبجەیی، دار الفكر، بیروت، چاپی یەكەم ٢٠٠٩.

٢٢. ڕێبەری قوتابخانەی هاوڕێی منداڵ لە كوردستان، محەمەدساڵح پێندرۆیی (جگەرسۆز)، چاپی یەكەم، ساڵی ٢٠١٣.

٢٣. گۆڤارەكانی بڕیار.

٢٤. ئەنتەرنێت.

## سەرچاوە فارسییەکان


٢٥. صد راز موفقیت در زندگی زناشویی، نفیسه معتکف، ناشر درسا، چاپ هفتم، سال چاپ ١٣٩٢.

٢٦. چگونه با کودکان رفتار کنیم، دکتر گاریر،دکتر محمد ولی سهامی، تهران، انتشارات مروارید چاپ سی و دوم، ساب ١٣٨٩.

٢٧. بچەهارا چگونه تربیت کنیم، کاظم زاده، انتشارات اقبال سال ١٣٥٨.

٢٨. جامعه و تعلیم و تربیت، دکتور علی شریعتمداری، چاپ سوم، سال ١٣٤٨.


## سەرچاوە عەرەبییەکان


٢٩. الكذب لدى الطفل و علاجه، دكتورمحمد حسن غانم، المكتبة المصرية، سنة ٢٠٠٦.

٣٠. تربية الطفل في الاسلام، الدكتورة حنان عبدالحميد العناني، دار الصفاء للنشر و التوزيع، الطبعة الاولى، سنة ٢٠٠١.

**پەرتووکە چاپکراوەکانی نووسەر:**

١. فەرهەنگی کانی (کوردی-کوردی)
٢. هونەرێ پەیڤینێ
٣. ٢٠٠٠ پەند ژ جیهانێ
٤. هونەرێ نڤیسینێ
٥. دەروونناسیا زارۆکان (دەروونزانی)
٦. گەڕیان ل دیف بەختەوەریێ
٧. پەیوەندی دناڤبەرا مامۆستای و قوتابیدا
٨. کلیلەکانی سەرکەوتن.
٩. کێشە ئاکاری و دەروونییەکانی منداڵ
١٠.ئاریشین ئاکاری و دەروونی یێن زارۆکی
١١.رەوشەنبیر کییە؟
١٢.خەزینا زانستی- بەرگێ یەکێ
١٣.خەزینا زانستی - بەرگێ دوویێ
١٤.مامۆستای باش و سەرکەوتوو کێیە؟ کرمانجی خواروو
١٥.مامۆستایێ باش و سەرکەفتی کییە؟ (کرمانجی)
١٦.رۆژنامەنووسی پرۆفیشناڵ و ئیتیکی رۆژنامەوانی
١٧.هونەری خوێندنەوە، ١٤٠ کلیل بۆ سەرکەوتنی قوتابی لە قوتابخانەدا
١٨.١٤٠ کلیل بۆ سەرکەفتنا قوتابی ل قوتابخانێ
١٩.خاڵخاڵۆک (هەڵبەستی منداڵان)
٢٠.کارگێڕیی قوتابخانە و بەڕێوەبەری سەرکەوتوو کرمانجی خواروو
٢١.کارگێڕیا قوتابخانێ و ڕێڤەبەرێ سەرکەفتی (کرمانجی)
٢٢.بنەما و ئادابەکانی دان وستاندن
٢٣.هونەرێ دان وستاندنێ (چەوا جوان دان و ستاندنێ بکەین)؟
٢٤.حەفت سەیر و سەمەرەکانی جیهان

٢٥.فەرهەنگی ڕسەن(بەرگی یەکەم)
٢٦.فەرهەنگی ڕسەن(بەرگی دووەم)
٢٧.قەیرانی کەم خوێندنەوە لە کوردستان
٢٨.ڕۆڵی خێزان و قوتابخانە لە ڕیشەکێشکردنی توندوتیژیدا
٢٩.ڕۆلێ مالباتێ و قوتابخانێ د بنەبڕکرنا توندوتیژیێدا (کرمانجی)
٣٠.پەندێن ژیانێ ژ گۆتنێن زانا و ناڤدارێن جیهانێ
٣١.نەڵند (١٠٠) سروود و هۆزانێن زارۆکان (شیعری منداڵان)
٣٢.ڕێبەرێ هشیارکرنێ ژ مەترسیێن مین و تەقەمەنیا
٣٣.سەرهاتیا هرچێ وجۆتیاری (چیرۆکەشیعر).
٣٤.ڕێبەری قوتابخانەی هاوڕێی منداڵ لە هەرێمی کوردستان
٣٥.سپاردە چییە؟
٣٦.پەروەردە وفێرکردنی منداڵ لە ئیسلامدا.
٣٧.پەروەردە و فێرکرنا زارۆکی دئیسلامێدا.
٣٨.ستەم لە تەرازووی ئیسلامدا.
٣٩. ڕۆڵی خێزان و قوتابخانە لە پەروەردە و فێرکردنی قوتابیدا (سۆرانی) .
٤٠. ڕۆلێ ماڵباتێ و قوتابخانێ دپەروەردە و فێرکرنا قوتابیدا (بادینی) .
٤١. ڕێبەرا قوتبخانا دۆستا زارۆکی ل هەرێما کوردستانێ
٤٢. هەڵە باوەکانی دایکان و باوکان بەرامبەر بە منداڵەکانیان، بەرگی یەکەم، محەمەدساڵح پێندرۆیی (جگەرسۆز)، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٦